


## ناسنامەی کتێب


| | |
|---|---|
| ناوی کتێب : | ویردەکان |
| | (کوڵبژێرێکە لە کتێبی قەڵای موسڵمانان) |
| بابەت : | ئایینی |
| ئامادەکردنی : | ستافی پرۆژەی سەدای سوننە |
| قۆناغی : | یەکەم |
| تایپ و دیزاین : | محمد حسێن خەتی |
| بەرگ : | مەولان |
| تیراژ : | ٥٠٠٠ دانە |
| ژمارەی لاپەڕە : | ١١٢ لاپەڕە |
| قەبارە : | ١٤ سم × ٢١ سم |

# ویــــردەکــــان

(گوڵبژێرێك لە كتێبی قەڵای موسڵمان)

ئامادەكردنی

ستافی پڕۆژەی سەدای سوننە

کوردستان / ١٤٣٩ - ٢٠١٨

# ناوەڕۆک

بسم الله الرحمن الرحيم

## پێشه‌كی:

إن الحمد لله نحمده ونستعينه ونستغفره ونعوذ بالله من شرور انفسنا ومن سيئات أعمالنا من يهده الله فلا مضل له ومن يضلل فلا هادي له واشهد أن لا إله إلا الله وحده لا شريك له واشهد أن محمدا عبده ورسوله.

{يَا أيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا اتَّقُوا اللهَ حَقَّ تُقَاتِه وَلا تَمُوتُنَّ إلا وَأنْتُمْ مُسْلِمُونَ}[1].

{يَا أيُّهَا النَّاسُ اتَّقُوا رَبَّكُمُ الَّذِي خَلَقَكُمْ مِنْ نَفْسٍ وَاحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنْهَا زَوْجَهَا وَبَثَّ مِنْهُمَا رِجَالاً كَثِيراً وَنِسَاءً وَاتَّقُوا اللهَ الَّذِي تَسَاءَلُونَ بِهِ وَالأرْحَامَ إنَّ اللهَ كَانَ عَلَيْكُمْ رَقِيباً}[2]

[1] آل عمران ١٠٢
[2] النساء ١

{يا أيها الذين آمنوا اتقوا الله وقولوا قولاً سديداً. يصلح لكم أعمالكم ويغفر لكم ذنوبكم ومن يطع الله ورسوله فقد فاز فوزاً عظيما}[٣] **أما بعد:**

**فإن أصدق الحديث كتاب الله، وأحسن الهدي هدي محمد صلى الله عليه وسلم، وشر الأمور محدثاتها، وكل محدثة بدعة، وكل بدعة ضلالة، وكل ضلالة في النار.**

**گرنگی دان بە سوننەت کە سەرچاوەی دووەمی یاسادانانە لە ئیسلامدا جێبەجێ کردنی فەرمانی الله تعالی یە کە لە چەندین ئایەت فەرمانمان پێ دەکات گوێ ڕایەڵی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه و على اله و سلم) بین و حوکم بگێڕینەوە لای ئەو، وەکو لە ئایەتی ژمارە (٦٥) لە سوورەتی (النساء) دا دەفەرموێ :** {فلا وربك لا يؤمنون حتى يحكموك فيما شجر بينهم ثم لا يجدوا في أنفسهم حرجا مما قضيت ويسلموا تسليما} **واتە : بێگومان ئیمان بەو جۆرە نابێ کە ئەوان گومان ئەبەن، قەسەم بەو خودایەی دروستکەری ئەمانە نابنە ئیمانداری ڕاستەقینە تا وایان لێ دێ کە بە ڕەزای دڵ و باوەڕەوە تۆ ئەکەنە حەکەم لەو ناکۆکییانەدا کە لەناویاندا ڕوونەدەن و هیچ گرێ لە دڵیاندا نەبێ لەو حوکمە تۆ ئەیدەیت و بە تەواوی ملکەچ ئەبن و بە گوێت ئەکەن.**[٤]

---

[٣] الأحزاب ٧٠ - ٧١

[٤] - تەفسیری گولبژێر ١٧٩٧.

وە لە شەش ئایەتی جیا لە سورەتەکانی (النساء الآیة ٥٩، المائدة الآیة ٩٢، النور الآیة ٥٤ و ٥٦، محمد الآیة ٣٣، التغابن الآیة ١٢) دەفەرموێ {وأطیعوا الرسول} واتە: گوێ ڕایەڵی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه و علی اله و سلم) بکەن،وە لە چەندین ئایەتی تریش بە چەندین شێوازی تر هەمان فەرمانمان پێ دەکات، ئیتر پێویستە هەموو کەسێك بزانێت هەموو دەرگاکانی گەیشتن بە ڕەزامەندی رب العالمین داخراوە تەنها ڕێگای شوێن پێ هەڵگرتنی محمد المصطفی (صلی الله علیه و علی اله و سلم) نەبێت، بۆیە خێری دونیاو قیامەتی بەندە لە پابەند بوونە بە سوننەت و لادان لەو ڕێگایەشدا بەلای ڕاست یان چەپ خزانە ناو ئاگری دۆزەخە، پەنا بە الله تعالی.

وە لە بەشێك لە سوننەتە پڕ خێر و بەرەکەتەکەشیدا ئەو (أذکار)ـارانەیە کە لە ناو پەرستشەکان و لە هەڵسوکەتی ڕۆژانەمان زۆر پێویستمان پێیان هەیە تاوەکو بە هۆیەوە الله تعالی وێڕای پاداشتی بێسنووری، بمانخاتە ناو قەڵغانێکی قایم و پارێزراو بین لە شەڕو خراپەی هەموو خراپەکارێك لە ئادەمی و جنۆکەو هەموو گیانلەبەرێکی خراپەکار (زیانبەخش).

ئیتر لەو سۆنگەیەوە ڕێکخراوی دیدی نوێ بە هەماهەنگی لەگەڵ دەزگای ڕۆشنبیری نوری حیکمە هەستان بە ئەنجامدانی پرۆژەی (سەدای سوننە) وەکو خزمەتێك بە سوننەتی پاکی پێشەوا (صلی الله علیه و علی اله و سلم) بە مەبەستی بەدەست هێنانی

ڕەزامەندی پەروەردگارو پاشان تاوەکو کۆمەڵێك لە تاکەکانی کۆمەڵگای کوردەواری ئاشنا بکەن بەو (أذکار)ــارانەی کە بە ڕێگای دروستەوە هاتوون تاوەکو بە هۆیەوە پارێزراو بن لە شەڕی شەیتانەکانی ئینس و جن بە پشتیوانی الله تعالى .

شایەنی باسە ئەو ویردانە گوڵبژێرێکە لە قەڵای موسلمانانی مامۆستا حمزە بەرزنجی، الله تعالى پاداشتی خێری بداتەوە.

و صلى الله و سلم على نبينا محمد و على آله و صحبه أجمعين.

و آخر دعوانا أن الحمد لله رب العالمين

د.عبدالله حداد

٢٣ی ڕەمەزان ١٤٣٩ کۆچی

٨ ی حوزەیران ٢٠١٨ زاینی

## لە ئادابەکانی پاڕانەوەو هۆیەکانی وەڵام دانەوەی[٥]

١) دڵسۆزی (الإخلاص) بۆ خوای گەورە.

٢) دەبێ بە سوپاس و ستایشی خوای گەورەو صەڵاوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ دەست پێ بکات.

٣) جەزم کردنی لە پاڕانەوەو بڕوابوون بە وەڵامدانەوەی.

٤) سووربوون و دووبارە کردنەوە (إلحاح) لە پاڕانەوەداو پەلەنەکردن. واتە نەڵێت پاڕامەوەو گیرا نەبوو.

٥) ئامادەبوونی دڵ لە کاتی پاڕانەوە.

٦) پاڕانەوە لە کاتی خۆشی و ناخۆشی و تەنگاوی و پێ گیراندا.

٧) جگە لە خوای گەورە لە کەس نەپاڕێتەوە.

٨) نەپاڕانەوە لە کەس و کارو سامان و منداڵ و خۆت بە خراپە.

٩) دەنگ نزم کردنەوە لە کاتی پاڕانەوەدا لە نێوان پەنهان و ئاشکرادا.

١٠) داننان بە تاوان و داواکردنی لێ خۆش بوون لە خوا و دان نان بە نیعمەت و سوپاس کردنی خوای گەورە لەسەری.

١١) زۆر لە خۆنەکردن لە ڕێکخستنی سەروا لە پاڕانەوەدا (عَدَم تَكلّف السّجع).

١٢) کوڕوزانەوەو خشوع و ئومێدو ترسان لەخوای گەورە.

---

[٥] بڕوانە ئەم ئاداب و هۆکانی وەڵام دانەوانە لەگەڵ بەڵگەکانیاندا لە (الذکر والدعاء والعلاج بالرقي من الکتاب والسنة) لاپەڕە ٨٨-٩٨.

١٣) گەڕاندنەوەی مافی ستەم لێ کراوان لەگەڵ تەوبەدا.

١٤) سێ بارەکردنەوەی پاڕانەوەکە.

١٥) ڕووکردنە ڕووگە (القِبلة).

١٦) دەست بەرز کردنەوە لە پاڕانەوەدا.[٦]

١٧) دەست نوێژ شوشتن پێش پاڕانەوە، ئەگەر گونجا.

١٨) سنور نەشکاندن لە پاڕانەوەدا (واتە نە پاڕانەوە بە شتی ستەم و مەحاڵ و دەنگی بەرز یان قوڵکردنەوەی مەسەلەیەك).

١٩) دەبێ دوعاکەر لە پێشدا بپاڕێتەوە بۆ خۆی پاشان ئەگەر ویستی بۆ غەیری خۆی بپاڕێتەوە.[٧]

---

[٦] بۆ شێوازەکانی دەست بەرزکردنەوە لە پاڕانەوەدا :
عن ابن عباس (رضي الله عنهما) انّ النبي ﷺ قال : (المَسالَةُ ان ترفَعَ يديكَ حَذوَ منكبَيكَ او نحوَهما، والإستغفارُ ان تُشيرُ باصبعِ واحدةٍ، والإبتهالُ ان تَمُدّ يَدَيكَ جميعاً) حديث صحيح اخرجهُ ابو داود (١٤٨٩ – ١٤٩١) مرفوعاً وموقوفاً.
واتە : بۆ داواکردن و پاڕانەوەی شتێك لە چاکە، یان دوور بوون لە خراپەیەك هەردوو دەستت تا ئاستی شانەکانت یان نزیکی بەرز دەکەیتەوە، وە بۆ داوای لێ خۆشبوون کردن لە خوای گەورە بە یەك پەنجە (کە پەنجەی شایەتمانە) ئاماژە دەکەیت، وە بۆ کاتی زۆر ناڕەحەتی و سەخڵەتی و پەرێشانی هەردوو دەستت درێژ دەکەیت.

[٧] چەسپاوە لە پێغەمبەرەوە ﷺ کەسەرەتا بەخۆی دەستی بە پاڕانەوە کردووە . هەروەها چەسپاویشە کە بەخۆی دەستی پێ نەکردووە وەکو پاڕانەوەی بۆ (انس وابن عباس وام اسماعيل وغەیری ئەوان)، وە بڕوانە درێژەی ئەم مەسەلەیە لە شەرحی نەوەوی دا بۆ (صحيح مسلم) (١٥/١٤٤) وە (تحفة الاحوذي) شەرحی (سنن الترمذي) ٩/٣٢٨، والبخاري مع الفتح ١/٣١٨.

٢٠) دەبێ تەوەسول بکات بۆ لای خوا بەناوە جوانەکانی و سیفەتە بەرزەکانی یان بەکردەوەیەکی چاك کە دوعاکەر خۆی ئەنجامی دابێت یان بە پاڕانەوەی پیاو چاکێکی زیندووی ئامادە کە بۆی بکات.

٢١) دەبێ خواردن و خواردنەوەو پۆشاکی حەڵاڵ بێت.

٢٢) نابێ بپاڕێتەوە بە تاوان یان بێ بەزەیی.

٢٣) دەبێ فەرمان بکات بە چاکەو بەرگری بکات لە خراپە.

٢٤) دوورکەوتنەوە لە هەموو جۆرە یاخی بوونێکی خوای گەورە.

## چەند کات و شێوازوشوێنێك کە پاڕانەوەی تیادا وەڵام دەدرێتەوە[٨]

١) شەوی قەدر.

٢) کۆتایی نیوەشەو.

٣) لە پاش هەموو نوێژە فەرزەکانەوە.[٩]

٤) لەنێوان بانگ و قامەتدا.

٥) کاتێك لە هەموو شەوێکدایە (سێیەمی کۆتایی شەو).

٦) لەکاتی بانگ بۆ نوێژە فەرزەکان (نێوان بانگ و قامەت).

٧) لەکاتی باران بارینیدا.

٨) لەکاتی تێك ڕژانی سوپاکان لەپێناوی خوادا.

٩) کاتێك لە ڕۆژی هەینی دایە : وە ڕاسترین ووتـە لەمـەدا ئەوەیـە کـە کۆتایی کاتە لەکاتەکانی عەسری ڕۆژی هەینی، وە واردیـش بـووە کـە ئەگونجێ لەو نێوانەدا بێت کە ئیمام لە کاتی ووتارداندا دائەنیشێ تـا نوێژەکە تەواو دەبێ.

---

[٨] بڕوانە ئەم کات و شێوازو شوێنانە لەگەڵ بەڵگەکانیان بەدرێژی لە (الذكر و الدعاء والعلاج بالرقي من الكتاب والسنة) لاپەڕە ١٠١ – ١١٣ .

[٩] ابن تيميه (رەحمەتی خوای لێ بێت) ئاماژە بەوە دەکات کەوا پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کرد بە مەعاذ کە لە پاش هەموو نوێژەکانەوە بڵێ : (اللهُمَّ اعِنِّي على ذِكرِكَ وشُكرِكَ وحُسنِ عِبادتِكَ)، وە باسی ئەوە دەکات کە (دُبر الصلاة) واتای پێش سڵاودانەوەیەو مانای دوای تەواوبوونی نوێژەکەش دەگەیەنێ.
بەڵام لە پێغەمبەرەوە ﷺ نەهاتووە کە لەدوای تەواوبوونی نوێژە فەرزەکانەوە بە کۆمەڵ پاڕابنەوە خۆ ئەگەر بیکردایە دەگەیشت پێمان.
بۆ زیاتر شارەزابوون بڕوانە (مجموع الفتاوى) (١٢/٢٨٩،٢٩٣،٣،٣) کەواتە وا باشە موسڵمان زۆربەی دوعاکانی لەناو نوێژەکەی دا بێت.

١٠) لەکاتی خواردنەوەی ئاوی (زەمزەم) لەگەڵ نیەتیێکی ڕاستدا. (لەکاتی نەخۆشیدا دەخورێتەوە، بەڵام بۆ دوعاکردن لەم کاتەدا بەڵگەم نەدیوە لەسەری) (م.عبدالكريم).

١١) لە کوڕنوش دا (السجود).

١٢) لەکاتی بەخەبەرهاتن لە شەوداو پاڕانەوە بە سوننەتی (ماثور)ی ئەو کاتەدا.

١٣) ئەگەر لەسەر پاکێتی (دەست نوێژ) خەوت و پاشان لەشەودا بەخەبەرهات و پاڕایەوە.

١٤) لەکاتی پاڕانەوەدا بە (لا إلهَ إلاّ انتَ سُبْحانَكَ إنّي كُنْتُ مِنَ الظالِمينَ).

١٥) پاڕانەوەی خەڵکی لە پاش مردنی کەسێك.

١٦) پاڕانەوە لەدوای ستایشی خواو صلاّوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە تەحیاتدا.

١٧) لەکاتی پاڕانەوە لەخوا بەو ناوە گەورەیەی (الإسمُ الأعظَم) [10] کە ئەگەر هەر کەسێك پێ ی بپاڕێتەوە وەڵام دەدرێتەوەو ئەگەر داوای پێ بکرێ پێ ی دەبەخشرێ.

---

[10] ناوە گەورەکەی خوای گەورە : (اللهم إني اسألُكَ بانّ لَكَ الحَمْدُ. لا إلهَ إلا انْتَ (وحدَكَ لا شريك لَكَ) المنّان (يا) بديعَ السمواتِ والأرض . ياذاالجَلالِ والإكرام. يا حَيُّ يا قَيّوم.... (ابو داود ٢/٨٠، وابن ماجة ٢/١٢٦٨، والنسائى ٣/٥٢، والترمذي ٥/٥٥٠، وة بروانة صحيح النسائي ١/٢٧٩.

١٨) پاڕانەوەی موسڵمان بۆ برا موسڵمانەکەی بە پەنهانی.

١٩) پاڕانەوە لە ڕۆژی عەرەفەدا لە عەرەفە.

٢٠) پاڕانەوە لە مانگی ڕەمەزان دا.

٢١) لە کاتی کۆبوونەوەی موسڵماناندا لە کۆڕی زیکردا.

٢٢) پاڕانەوە لە کاتی بەڵاو موسیبەتتدا بە ووتنی : (إنا لله وإنا إليهِ راجعونَ اللهُمَّ اجُرْني في مُصيبَتى واْخلِف لي خيراً مِنْها).

٢٣) پاڕانەوە لەکاتی ڕووکردنی دڵ بۆ لای خوای گەورەو تاوسەندنی دڵسۆزی (الإخلاص).

٢٤) پاڕانەوەی ستەم لێ کراو لەو کەسەی ستەمی لێ کردووە.

٢٥) پاڕانەوەی باوك لە کوڕەکەی بە چاکەو خراپە.

٢٦) پاڕانەوەی گەشتیار (المُسافر).

٢٧) پاڕانەوەی ڕۆژووەوان هەتا بەربانگ دەکاتەوە.

٢٨) پاڕانەوەی ڕۆژووەوان لەکاتی بەربانگ کردنەوەدا.

٢٩) پاڕانەوەی ناچارو لێ قەوماو و پێ گیراو.

٣٠) پاڕانەوەی پێشەوای دادپەروەر.

٣١) پاڕانەوەی کوڕی چاکەکار لەبۆ دایك و باوکی .

٣٢) پاڕانەوە لە دوای دەست نوێژ ئەگەر پاڕایەوە بە سوننەتی (مأثور)ی ئەوکاتە.

٣٣) پاڕانەوەی دوا ڕەجم کردنی (الجَمرةُ الصُغری).

٣٤) پاڕانەوەی دوای ڕەجم کردنی (الجَمرةُ الوسطی).

٣٥) پاڕانەوە لەناو کەعبەدا. هەر کەس نوێـژی کـرد لـەناو (الحِجر)دا ئەوا هەر بە (البَیت) حسابە.

٣٦) پاڕانەوە لەسەر (صەفا).

٣٧) پاڕانەوە لەسەر (مەڕوە).

٣٨) پاڕانەوە لەلای (المَشعَرُ الحَرام)دا.

وە بڕوادار هەردەم لە پەروەردگاری خۆی دەپاڕێتەوە لە هەر شـوێنێکدا بێت ﴿وإذا سألك عبادي عنّي فإني قريبٌ أجيبُ دعوة الداعِ إذا دَعانِ ...﴾، بەڵام ئەو کات و شوێن و شێوازانە پێویستی یان بەچـاودێری و گرنگی پێدانی زیاتر هەیە.[11]

[11] بۆ مەبەستی زیاتر شارەزابوون بڕوانە (الدعاء وبلية العلاج ...) لا ٦-١٧.

# فەزڵ و گەورەیی (ذیکر) کردن

خـوای گـەورە دەفـەرموویّت : ﴿ فَاذْكُرُونِي أَذْكُرْكُمْ وَاشْكُرُوا لِي وَلَا تَكْفُرُونِ ﴿١٥٢﴾ ﴾ البقرة : ١٥٢.

واتە : ذیکر و یادم بکـەن، بـاس و یادتـان دەکـەم و بـێ بـاوەڕی مەکـەن بەرامبەرم.[١٢]

وە پێغەمبەر دەفەرموویّت ﷺ : {مَثَلُ الَّذِي يَذْكُرُ رَبَّهُ وَالَّذِي لَا يَذْكُرُ رَبَّهُ مَثَلُ الْحَيِّ وَالْمَيِّتِ}[١٣]

**واتە : نمونەی ئەو کەسەی کە یادی پەروەردگاری دەکات و ئەو کەسـەی کە یادی پەروەردگاری ناکات وەکو نموونەی زیندو و مردوو وایە.**

وە **دەفـەرموویّت** ﷺ : {مَا جَلَسَ قَوْمٌ مَجْلِسًا لَمْ يَذْكُرُوا اللَّهَ فِيهِ وَلَمْ يُصَلُّوا عَلَى نَبِيِّهِمْ إِلَّا كَانَ عَلَيْهِمْ تِرَةً، فَإِنْ شَاءَ عَذَّبَهُمْ وَإِنْ شَاءَ غَفَرَ لَهُمْ}[١٤].

**واتە : هیچ کاتێك کۆمەڵێك دانانیشن و لە مەجلیسێکدا کـە ذیکـری خوای تێدا نەکەن و صلآواتیان تیایدا نەدابێ لەسەر پێغەمبەرەکـەیان ﷺ**

---

[١٢] مختصر تفسير ابن كثير ١٤٢/١.

[١٣]) البخاري مع الفتح ١١ / ٢٠٨ ومسلم بلفظ {مثل البيت الذي يذكر الله فيه والبيت الذي لا يذكر الله فيه مثل الحي والميت} ١ / ٥٣٩.

[١٤]) الترمذي وانظر صحيح الترمذي١٤٠/٣.

ئیلا دەبێتە خراپی و ناتەواویی و پەشیمانی بۆیان، ئەگەر خوای گەورە ویستی بێت سزایان دەدات و ئەگەر ویستی بوو لێیان خۆش دەبێ.

# ذیکرەکان

## هەستان لە خەو

{الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَحْيَانَا بَعْدَ مَا أَمَاتَنَا وَإِلَيْهِ النُّشُورُ}[١٥].

واتە : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە ژیاندینی یەوە دوای ئەوەی کە مراندینی (مەبەست بە مراندنێکی مەجازی یە کە خەوتنە) وە زیندووبوونەوەش هەر بۆ لای ئەوە.

## پێش خەوتن

١) ئەگەر چووە ناو جێگەی نووستن دەستی بدات لەیەك و پاشان فووی پێدا بکات و سورەتی ﴿قل هو الله أحد﴾ و ﴿قل أعوذ برب الفلق﴾ و ﴿قل أعوذ برب الناس﴾ی پیادا بخوێنێ. پاشان دەستی بهێنێ لەسەر ئەو شوێنەدا کە ئەتوانێ لە لەشی. وە لەسەری لەگەڵ دەم و چاوی و پێشەوەی لەشییەوە دەست پێ بکات، وە ئەمە سێ بارە بکاتەوە.[١٦]

[١٥]) البخاري مع الفتح ١١/ ١١٣ ومسلم ٢٠٨٣/٤.

[١٦] البخاري مع الفتح ٦٢/٩، ومسلم ١٧٢٣/٤. چونکە پێغەمبەر ﷺ ئاوای دەکرد.

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ قُلْ هُوَ اللَّهُ أَحَدٌ ﴿١﴾ اللَّهُ الصَّمَدُ ﴿٢﴾ لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ ﴿٣﴾ وَلَمْ يَكُن لَّهُ كُفُوًا أَحَدٌ ﴿٤﴾ ﴾ الإخلاص: ١ - ٤

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ الْفَلَقِ ﴿١﴾ مِن شَرِّ مَا خَلَقَ ﴿٢﴾ وَمِن شَرِّ غَاسِقٍ إِذَا وَقَبَ ﴿٣﴾ وَمِن شَرِّ النَّفَّاثَاتِ فِي الْعُقَدِ ﴿٤﴾ وَمِن شَرِّ حَاسِدٍ إِذَا حَسَدَ ﴿٥﴾ ﴾ الفلق: ١ - ٥

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ قُلْ أَعُوذُ بِرَبِّ النَّاسِ ﴿١﴾ مَلِكِ النَّاسِ ﴿٢﴾ إِلَٰهِ النَّاسِ ﴿٣﴾ مِن شَرِّ الْوَسْوَاسِ الْخَنَّاسِ ﴿٤﴾ الَّذِي يُوَسْوِسُ فِي صُدُورِ النَّاسِ ﴿٥﴾ مِنَ الْجِنَّةِ وَالنَّاسِ ﴿٦﴾ ﴾ الناس: ١ ــ ٦.

**٢) ئەگەر چوویتە سەر جێگاکەت (آيةُ الكُرسي) بخوێنەو تەواوی بکە. چونکە پارێزەرێکت لەلایەن خواوە لەگەڵدا دەبێت و شەیتان نزیکت ناکەوێتەوە تا بەیانی.**[١٧]

---

[١٧] **البخاری مع الفتح ٤/٤٨٧.**

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ الْحَيُّ الْقَيُّومُ ۚ لَا تَأْخُذُهُ سِنَةٌ وَلَا نَوْمٌ ۚ لَّهُ مَا فِي السَّمَاوَاتِ وَمَا فِي الْأَرْضِ ۗ مَن ذَا الَّذِي يَشْفَعُ عِندَهُ إِلَّا بِإِذْنِهِ ۚ يَعْلَمُ مَا بَيْنَ أَيْدِيهِمْ وَمَا خَلْفَهُمْ ۖ وَلَا يُحِيطُونَ بِشَيْءٍ مِّنْ عِلْمِهِ إِلَّا بِمَا شَاءَ ۚ وَسِعَ كُرْسِيُّهُ السَّمَاوَاتِ وَالْأَرْضَ ۖ وَلَا يَئُودُهُ حِفْظُهُمَا ۚ وَهُوَ الْعَلِيُّ الْعَظِيمُ ﴿٢٥٥﴾ ﴾ البقرة: ٢٥٥

**٣) هەر کەسێ دوو ئایەتی کۆتایی سورەتی (البقرة) بخوێنی لە شەودا ئەبێتە پاراستن بۆی و بەسیەتی.[١٨]**

أَعُوذُ بِاللَّهِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ

بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَٰنِ الرَّحِيمِ

﴿ آمَنَ الرَّسُولُ بِمَا أُنزِلَ إِلَيْهِ مِن رَّبِّهِ وَالْمُؤْمِنُونَ ۚ كُلٌّ آمَنَ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ لَا نُفَرِّقُ بَيْنَ أَحَدٍ مِّن رُّسُلِهِ ۚ وَقَالُوا سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا ۖ غُفْرَانَكَ رَبَّنَا وَإِلَيْكَ الْمَصِيرُ ﴿٢٨٥﴾ لَا يُكَلِّفُ اللَّهُ نَفْسًا إِلَّا وُسْعَهَا ۚ لَهَا مَا كَسَبَتْ وَعَلَيْهَا مَا اكْتَسَبَتْ ۗ رَبَّنَا لَا تُؤَاخِذْنَا إِن نَّسِينَا أَوْ

[١٨] البخاري مع الفتح ٩/٩٤، ومسلم ١/٥٥٤.

أَخۡطَأۡنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تَحۡمِلۡ عَلَيۡنَآ إِصۡرٗا كَمَا حَمَلۡتَهُۥ عَلَى ٱلَّذِينَ مِن قَبۡلِنَاۚ رَبَّنَا وَلَا تُحَمِّلۡنَا مَا لَا طَاقَةَ لَنَا بِهِۦۖ وَٱعۡفُ عَنَّا وَٱغۡفِرۡ لَنَا وَٱرۡحَمۡنَآۚ أَنتَ مَوۡلَىٰنَا فَٱنصُرۡنَا عَلَى ٱلۡقَوۡمِ ٱلۡكَٰفِرِينَ ﴿٢٨٦﴾ ﴾ البقرة: ٢٨٥ ــ ٢٨٦.

**٤) ﴿قُل يا أيّها الكافرون﴾ بخوێنە، چونکە بۆت دەبێتە (بەرائـەت لـە شیرك)[١٩]، واتە : ڕزگاربوون یان قوتار بوون لە هاوبەشی پەیـدا کـردن (وە سوود بەخشە بۆ یەکتاپەرستی).**

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلۡكَٰفِرُونَ ﴿١﴾ لَآ أَعۡبُدُ مَا تَعۡبُدُونَ ﴿٢﴾ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴿٣﴾ وَلَآ أَنَا۠ عَابِدٞ مَّا عَبَدتُّمۡ ﴿٤﴾ وَلَآ أَنتُمۡ عَٰبِدُونَ مَآ أَعۡبُدُ ﴿٥﴾ لَكُمۡ دِينُكُمۡ وَلِيَ دِينِ ﴿٦﴾ ﴾ الكافرون: ١ ــ ٦

---

[١٩] لە (فروەی کوڕی نوفل)ەوە هاتە لای پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (ئەی پێغەمبەری خوا شتێکم فێربکە کە چوومە سەر جێگاکەم بیڵێم، ئەویش فەرمووی .... فەرموودەکە) رواه الترمذي وابو داود وقد صححه الالباني في صحيح السنن الترمذي ٣/١٤٥. وفي صحيح سنن ابي داود ٣/٩٥٣-٩٥٤ رقم (٥٠٥٥) و فيه : عن فروة بن نوفل عن ابيه. وە زیادەیەکی لەگەڵ لە (سنن ابی داود)دا ئەویش ئەمەیە : (پاشان بە کۆتایی پێ هێنانی بنوو، چونکە بۆت دەبێت بەرائەت لە شیرك).

٥) ئەگەر لەسەر جێگاکەت هەستایت و گەڕایتەوە سەری . سێ جار بە لوێچێکی کراس و جلەکەت جێگاکەت بتەکێنە. وە (بسم الله) بکە چونکە تۆ نازانی دوای خۆت چی تێ چووە لە زیندەوەرو شتی زیان بەخش وە کە ڕاکشایت بڵێ : {بِاسْمِكَ رَبِّ وَضَعْتُ جَنْبِي وَبِكَ أَرْفَعُهُ إِنْ أَمْسَكْتَ نَفْسِي فَارْحَمْهَا وَإِنْ أَرْسَلْتَهَا فَاحْفَظْهَا بِمَا تَحْفَظُ بِهِ عِبَادَكَ الصَّالِحِينَ}[٢٠].

واتە : بەناوی تۆ پەروەردگارم تەنیشتم دانا و بەناوی تۆوە بەرزی دەکەمەوە، ئەگەر نەفسی منت گرتەوە بەزەییت پێداوە بێتەوە، وە ئەگەر ناردتەوە ئەوا بیپارێزە بەوەی کە بەندە صاڵحەکانتی پێ دەپارێزی.

٦) {اللَّهُمَّ إِنَّكَ خَلَقْتَ نَفْسِي وَأَنْتَ تَوَفَّاهَا لَكَ مَمَاتُهَا وَمَحْيَاهَا إِنْ أَحْيَيْتَهَا فَاحْفَظْهَا وَإِنْ أَمَتَّهَا فَاغْفِرْ لَهَا اللَّهُمَّ أَسْأَلُكَ الْعَافِيَةَ}[٢١].

واتە : خوایە تۆ نەفسی منت بەدی هێناوەو تۆ دەیمرێنی. مردن و ژیانی بۆ تۆیە. ئەگەر ژیاندت بیپارێزەو ئەگەر مراندت لێ ی خۆش ببە. خوایە داوای پارێزراوی و لەش ساغیت لێ دەکەم.

---

[٢٠]) البخاري ١٢٦/١١. ومسلم ٢٠٨٤/٤.

[٢١]) اخرجه مسلم ٢٠٨٣/٤ واحمد بلفظه ٧٩/٢.

٧) پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بیویستایە بخەوێت دەستی ڕاستی دەخستە ژێر ڕوومەتی و دەیفەرموو : {اللَّهُمَّ قِنِي عَذَابَكَ يَوْمَ تَبْعَثُ عِبادَكَ}[٢٢].

واتە : خوایە بمپارێزە لە سزاکەت لەو ڕۆژەدا کە بەندەکانت زیندوو دەکەیتەوە.

٨) {باسْمِكَ اللَّهُمَّ أَمُوتُ وأَحْيا}[٢٣].

واتە : بەناوی تۆوە خوایە دەمرم و دەژیم.

٩) ئایا شتێکتان پێ بڵێم کە چاکتر بێت بۆ هەردووکتان لە خزمەتکارێك، ئەگەر چوونە سەر جێگا (٣٣) جار (سُبحان الله) و، (٣٣) جار (الحمدلله) و، (٣٤) جار (الله أكبر) بکەن، ئەوە چاکترە بۆ ئێوە لە خزمەتکار.[٢٤].

١٠) {الحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي أَطْعَمَنَا وسَقَانَا وَكَفَانَا وَآوَانَا فَكَمْ مِمَّنْ لَا كَافِيَ لَهُ وَلَا مُؤْوِيَ}[٢٥].

واتە : سوپاس بۆ ئەو خوایەی کە تێری کردین و تێر تاوی کردین و پێویستی نەخستینە غەیری خۆی و کیفایەتی داین و جێ نشینی کردین.

---

[٢٢]) ابو داود بلفظه ٣١١/٤ وانظر صحيح الترمذي ١٤٣/٣.

[٢٣]) البخاری مع الفتح ١١٣/١١ ومسلم ٢٠٨٣/٤.

[٢٤]) پێغەمبەری خوا ﷺ ئەمەی بە ئیمامی عەلی و فاطمەی کچی فەرمووی کاتێ داوای خزمەتکاریان لێ کرد کە بۆیان بگرێ. البخاری مع الفتح ٧١/٧، ومسلم ٢٠٩١/٤.

[٢٥]) مسلم ٢٠٨٥/٤.

**زۆر کەس هەیە خـوا بـە بـەس نـازانیّ. (بـە هاوبـەش دانـان بـۆی). وە مولگەی نیشتەجیّ ی نی یە.**

**١١)** {اللَّهُمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، وَأَنْ أَقْتَرِفَ عَلَى نَفْسِي سُوءاً أَوْ أَجُرَّهُ إِلَى مُسْلِمٍ}[٢٦].

**واتە : خوایە ئەی زانای غەیب و ئاشکرا. ئەی بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی. پەروەردگارو پاشای هـەموو شـتەکان. شـایەتی دەدەم کـە هـیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە تـۆ. پـەنا دەگـرم پێـت لـە خراپـەی نەفسم. وە لە خراپەیەك بەسەر نەفسمدا یان بیئالێنم لە موسلمانێکەوە.**

**١٢) پێغەمبەر ﷺ نەدەخەوت، هەتا سـورەتی (السّجدة) ﴿الم ...تنزیـل ....﴾ و ﴿تبارك الذي بیده الملك ..﴾ی دەخوێند[٢٧].**

**١٣) ئەگەر چوویتە سەر جێگای نوستن دەست نوێژی نوێژ بشۆرەو پاشـان لەسەر لای ڕاستت ڕابکشیّ و پاشان بلیّ :** {اللَّهُمَّ أَسْلَمْتُ نَفْسِي إِلَيْكَ وَفَوَّضْتُ أَمْرِي إِلَيْكَ وَأَلْجَأْتُ ظَهْرِي إِلَيْكَ رَهْبَةً وَرَغْبَةً إِلَيْكَ لَا مَلْجَأَ وَلَا

---

[٢٦]) **ابو داود ٣١٧/٤ وانظر صحیح الترمذي ١٤٢/٣.**

[٢٧]) **الترمذي والنسائي وانظر صحیح الجامع ٢٥٥/٤. لەگەڵ سورەتی (الاسراء) و (الزمر)دا. الصحیحة (٦٤٢/٢) رقم الحدیث : (٦٤١).**

مَنْجَا مِنْكَ إِلّا إِلَيْكَ آمَنْتُ بِكِتَابِكَ الَّذِي أَنْزَلْتَ وَبِنَبِيِّكَ الَّذِي أَرْسَلْتَ}(٢٨).

**واته : خوایه نەفسم تەسلیمی تۆ کردو کاروباری خۆم دایه دەستی تۆ، وه ڕووم کرده تۆو پشتم بەست بەتۆ. بەپێ خۆشبوون حەز پێ کردن و بەترسان لەتۆ . هیچ حەشارگەو شوێنی ڕزگاربوونێك نی یه مەگەر بۆ لای تۆ. باوەڕم هێناوه بەکتێبەکەت کە داتبەزاندۆتە خوارەوه، وه بەو پێغەمبەرت ﷺ کە ناردووتەو ڕەوانەت کردووه.**

## داچڵەکین له خەوداو خەو لێ نەکەوتن

{أَعُوذُ بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّاتِ مِنْ غَضَبِهِ وَعِقَابِهِ وَشَرِّ عِبَادِهِ وَمِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ وَأَنْ يَحْضُرُونِ}(٢٩).

**واته : پەنا ئەگرم به ووشه تەواوەکانی خوای گەوره له خەشم و سزای و له خراپەی بەندەکانی و له شێتی شەیتانەکان و لەو کاتانەی کە لە ژیاندا دێنه لام بۆ گومڕاکردنم یان کاتێ لەسەر مەرگ دام و دێنه لام.**

**ئەگەر خەونی ڕاست و خۆش (الرؤيا) یان خەونی درۆو ناخۆش (الحُلم)ت بینی**

---

(٢٨) فەرمووی ﷺ ئەگەر ئەمە بڵێیت و بمریت لەسەر فیترەت دەمری. (وه باکۆتا شتێك بێت کە دەیڵێیت). البخاري مع الفتح ١١٣/١١ ومسلم ٢٠٨١/٤.

(٢٩) ابو داود ١٢/٤ وانظر صحيح الترمذي ١٧١/٣.

خەونی خۆش و چاك لەلایەن خواوەیەو خەونی ناخۆش لە شەیتانەوەیە. ئەگەر یەکێك لە ئێوە خەونی خۆشی بینی با لـەلای خۆشەویـستی خـۆی نەبێ باسـی نـەکات... فەرمووەدەکـە...[٣٠] وە کورتـەی ئـەو شـتانەی کـە دەیکات لەکاتی بینینی خەونی ناخۆش دا ئەمانەن :

١-سێ جار تف دەکات بەلای چەپی دا.[٣١]

٢-سێ جار پەنا دەگرێ بەخوای گەورە لە شەیتان و لە خراپەی ئەوەی کـە بینوویەتی.[٣٢]

٣-لەلای کەس باسی ناکات و نایگێڕێتەوە.[٣٣]

٤-لەسەر ئەو لایە وەردەگەڕێ کە لەسەری بووە.[٣٤]

٥-هەڵدەستێ و نوێژ دەکات ئەگەر ویستی.[٣٥]

---

[٣٠] مسلم بلفظه ٤/١٧٧١ والبخاري ٧/٢٤.

[٣١] مسلم ٤/١٧٧١.

[٣٢] مسلم ٤/١٧٧٢، ١٧٧٣.

[٣٣] مسلم ٤/١٧٧١.

[٣٤] مسلم ٤/١٧٧٣.

[٣٥] مسلم ٤/١٧٧٣.

## ذیکرەکانی بەیانیان و ئێواران

۱) هەر کەسێك بەیانیان (آیة الكُرسي) بخوێنێت لە جنۆکە دەپارێزرێ هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە. وە هەر کەس ئێوارە بیخوێنێ دەپارێزرێ لێیان تا بەیانی.[۳٦]

۲) لە عبدالله ی کوڕی خوبەیبەوە فەرمووی : پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (قُلْ) واتە : بڵێ، وتم : ئەی پێغەمبەری خوا چی بڵێم؟ فەرمووی ﴿قل هو الله أحد﴾ و ﴿الفَلق﴾ و ﴿الناس﴾ بخوێنە، ئێواران و بەیانیان سێ جار بەستەو لە هەموو شتێك دەپارێزرێیت.[۳۷]

۳) بەیانیان بڵێ : {أَصْبَحْنا وَأَصْبَحَ الْمُلْكُ لِلَّهِ(۳۸)، وَالْحَمْدُ لِلَّهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ. لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. رَبِّ أَسْأَلُكَ خَيْرَ مَا فِي هَذَا الْيَوْمِ وَخَيْرَ مَا بَعْدَه(۳۹)، وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا فِي

---

[۳٦] اخرجه الحاكم ٥٦٢/١ وصححه الالباني في صحيح الترغيب والترهيب ٢٧٣/١، وعزاه الى النسائي والطبراني وقال : إسناد الطبراني جيد. بڕوانە لاپەڕە (۳۲) بۆ (آية الكرسي).

[۳۷] اخرجه ابو داود ٣٢٢/٤ والترمذي ٥٦٧/٥ وانظر صحيح الترمذي ١٨٢/٣. وهو حديث حسن.

[۳۸]) وە ئێواران بڵێ : امسينا وامسى الملك لله.

[۳۹]) وإذا امسى قال: رب اسالك خير ما في هذه الليلة وخير ما بعدها واعوذ بك من شر هذه الليلة وشر ما بعدها.

هذِهِ اليَومِ وَشَرِّ مَا بَعْدَهُ. رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكَسَلِ وَسُوءِ الْكِبَرِ. رَبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابٍ فِي النَّارِ وَعَذَابٍ فِي الْقَبْرِ }[٤٠].

**واتە : بەیانیمان بەسەردا هات و موڵك بەیانی بەسەردا هات بۆ خوای گەورە، وە ستایش بۆ خوایەو هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە (الله) تەنهایەو هاوبەشی نی یە. موڵك و سوپاس بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بەتوانایە. پەروەردگار داوای خێری ئەمڕۆو خێرو چاكەی دوای ئەمڕۆت لێ دەكەم و پەنات پێ ئەگرم لە خراپەی ئەوەی لەمڕۆدایەو لەدوای ئەمڕۆدایە. پەروەردگار پەنات پێ ئەگرم لە تەمبەڵی و لەش قورسی و خراپەی تەمەن پیری. پەروەردگار پەنات پێ ئەگرم لە سزایەك لە ئاگری دۆزەخ و سزایەك لە گۆڕدا تووشم ببێت.**

٤) {اللّهُمَّ بِكَ أَصْبَحْنا، وَبِكَ أَمْسَيْنا[٤١]، وَبِكَ نَحْيا، وَبِكَ نَمُوت وَإِلَيْكَ النُّشور }[٤٢].

[٤٠] مسلم ٢٠٨٨/٤.

[٤١] وەكاتی ئێوارە بڵێ: {اللهم بك امسينا وبك اصبحنا وبك نحيا وبك نموت وإليك المصير} .واتە : خوایە بەناوی تۆوە ئێوارەمان بەسەردا هات و بەناوی تۆوە بەیانیمان بەسەردا هات و بەناوی تۆوە دەژیم و دەمرم وە چارەنووس بۆ لای تۆیە .

[٤٢] الترمذي ٤٦٦/٥ وانظر صحيح الترمذي ١٤٢/٣.

**واتە : خوایە بەناوی تۆوە بەیانیمان بەسەردا هات و ئێوارەمان بەسەردا هاتوو، بەناوی تۆوە دەژیم و دەمرم و زیندوو بوونەوە بۆ لای تۆیە.**

**٥)** {اللَّهُمَّ أَنْتَ رَبِّي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، خَلَقْتَنِي وَأَنَا عَبْدُكَ وَأَنَا عَلَى عَهْدِكَ وَوَعْدِكَ مَا اسْتَطَعْتُ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ مَا صَنَعْتُ أَبُوءُ لَكَ بِنِعْمَتِكَ عَلَيَّ وَأَبُوءُ لَكَ بِذَنْبِي فَاغْفِرْ لِي فَإِنَّهُ لَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ}[٤٣].

**واتە : خودایە تۆ پەروەردگارمی هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە تۆ. بەدیت هێناوم و من بەندەی تۆم و من لەسەر پەیمان و بەڵێنەکەمم کە بەتۆم داوە تا بتوانم. پەنات پێ دەگرم لەخراپەی ئەوەی ئەنجامم داوە لە گوناه. دان ئەنێم بە نیعمەتەکاندا لەسەرم و دان ئەنێم بە گوناهەکانم دا. ساخوایە لێم خۆشبە، بە ڕاستی کەس لە گوناه خۆش نابێ جگە لە تۆ.**

**٦)** {اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَدَنِي اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي سَمْعِي اللَّهُمَّ عَافِنِي فِي بَصَرِي لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ، اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنَ الْكُفْرِ وَالْفَقْرِ أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ}[٤٤] **(بەیانیان و ئێواران سێ جار).**

---

**[٤٣]) هەر کەسێ ئێوارە بە یەقینەوە بیڵێ و شەو بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە وە هەر کەسێ بەیانی بە یەقینەوە بیڵێ و ئەو ڕۆژە بمرێ دەچێتە بەهەشتەوە،، اخرجە البخاری ١٥٠/٧.**

خوایە لەش و بیستن و بنینینم پارێزراو بکە هیچ پەرستراوێك نـی یـە بە هەق جگە لە تۆ. خوایە پەنات پیٚ ئەگرم لە بـیٚ بـاوەڕی و هـەژاری و پەنات پیٚ ئەگرم لە سزای گۆڕ، هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە تۆ.

٧) {اللَّهُـمَّ إِنِّ أَسْـأَلُكَ الْعَافِيَـةَ فِي الـدُّنْيَا وَالآخِـرَةِ اللَّهُـمَّ إِنِّ أَسْـأَلُكَ الْعَفْـوَ وَالْعَافِيَـةَ: فِي دِينِي وَدُنْيَـايَ وَأَهْلِـي وَمَـالِي اللَّهُـمَّ اسْتُرْ عَوْرَاتِي وَآمِنْ رَوْعَـاتِي اللَّهُـمَّ احْفَظْنِي مِنْ بَيْنِ يَدَيَّ وَمِنْ خَلْفِي وَعَنْ يَمِينِي وَعَنْ شِمَالِي وَمِنْ فَوْقِي وَأَعُوذُ بِعَظَمَتِكَ أَنْ أُغْتَالَ مِنْ تَحْتِي }**بەیانیان و ئێواران** .[٤٥]

واتە : خوایە من داوای لیٚ خـۆش بـوون و پارێزراویـت لیٚ دەکـەم لـە دنیاو دوارِۆژدا. خودایە داوای لیٚ بوردن و پارێزراویت لیٚ دەکەم لە دیـن و دونیاو کەس و کارو ماڵ و سەروەتم دا. خوایـە عـەیبم داپۆشـەو تـرس و دڵەڕاوکیٚ و وەرست بوونم مەهێڵـە. خوایـە بمپـارێزە لـە بەردەمـەوەو لـە دوامەوەو لە ڕاستم و چەپم و سەرەوەم. وە پەنا ئەگرم بە گەورەیی تـۆ کـە لە ژێرەوە سزا بدرێم و پیٚ بکرێم.

---

[٤٤]) ابو داود ٣٢٤/٤، واحمد ٤٢/٥ والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم٢٢، وابن السني برقم ٦٩ والبخاري في الأدب المفرد وحسن العلامة ابن باز إسناده في تحفة الأخيار ص٢٦.

[٤٥])ابو داود وابن ماجه وانظر صحيح ابن ماجه ٣٣٢/٢.

٨) {اللَّهُمَّ عَالِمَ الْغَيْبِ وَالشَّهَادَةِ فَاطِرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضِ رَبَّ كُلِّ شَيْءٍ وَمَلِيكَهُ أَشْهَدُ أَنْ لا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّ نَفْسِي وَمِنْ شَرِّ الشَّيْطَانِ وَشِرْكِهِ، وَأَن أَقْتَرِفَ عَلَى نَفسي سُوءاً، أَوْ أَجُرَّهُ إِلَى مُسْلِمٍ} **بەیانیان و ئێواران**[٤٦].

**واتە : خوایە زانای نهێنی و ئاشکرای، بەدیهێنەری ئاسمانەکان و زەوی پەروەردگارو پادشای هەموو شتێك. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نیە بە حەق جگە لە تۆ. پەنا ئەگرم پێت لە خراپەی نەفسم و لە شەڕو خراپەو هاوبەش دانانی شەیتان. وە لەوەی کە نەفسم تووشی خراپەیەك بکەم یان بینالێنم لە موسڵمانێکەوە.**

٩) {بِسْمِ اللَّهِ الَّذِي لَا يَضُرُّ مَعَ اسْمِهِ شَيْءٌ فِي الْأَرْضِ وَلَا فِي السَّمَاءِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ}[٤٧] **(بەیانیان و ئێواران سێ جار).**

**واتە : بەناوی ئەو خوایەی لەگەڵ ناوی ئەودا هیچ شتێك زیان ناگەیەنێ نە لەزەوی و نە لە ئاسماندا ئەو خوایە بیسەرو زانایە.**

---

[٤٦]) الترمذي وابو داود، وانظر: صحيح الترمذي ١٤٢/٣.

[٤٧]) من قالها ثلاثا إذا اصبح وثلاثا إذا امسى لم يضره شيء.

اخرجه ابو داود ٣٢٣/٤ والترمذي ٤٦٥/٥ وابن ماجه واحمد. انظر: صحيح ابن ماجه ٣٣٢/٢ وحسن إسناده العلامة ابن باز في تحفة الأخيار ص٣٩.

**١٠) بەیانیان یەك جار بڵێ :** {رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا، وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا، وبمحمد صَلَّى اللهُ عَلَيْه وسَلَّم نَبِيّاً}[٤٨].

**واتە : ڕازیم بە (الله كە پەروەردگارم بێ و ئیسلام دین و بەرنامەم بێت و موحەممەدیش ﷺ پێغەمبەرو پێشەوام بێت.**

**١١)** {يا حَيُّ يا قَيُّومُ بِرَحْمَتِكَ أَسْتَغِيثُ، أَصْلِحْ لِي شَأْنِي كُلَّه وَلا تَكِلْنِي إِلى نَفْسِي طَرْفَةَ عَيْنٍ} **بەیانیان و ئێواران**[٤٩].

**واتە : ئەی زیندووی ڕاگرو هەڵسوڕێنەری بوونەوەر، بە بەزەیت داوای فریاكەوتنت لێ دەكەم. هەموو كاروبارم چاك بكەو بۆ چاولێك نانێك مەمدەرە دەستی نەفسی خۆم.**

**١٢)** {أَصْبَحْنَا عَلَى فِطْرَةِ الْإِسْلَامِ[٥٠] وَعَلَى كَلِمَةِ الْإِخْلَاصِ وَعَلَى دِينِ نَبِيِّنَا مُحَمَّدٍ صَلَّى اللهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَعَلَى مِلَّةِ أَبِينَا إِبْرَاهِيمَ حَنِيفًا مُسْلِمًا وَمَا كَانَ مِنْ الْمُشْرِكِينَ}[٥١].

---

[٤٨]) هەر كەسێك بەیانیانی هەموو ڕۆژێك بڵێ ......فەرموودەكە ...... من كەفیل و گرنتی ئەدەمێ كە دەستی بگرم تا دەیبەمە بەهەشتەوە.
احمد ٣٣٧/٤ والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم: ٤ وابن السني برقم ٦٨ وابو داود ٣١٨/٤ والترمذي ٤٦٥/٥ وحسنه ابن باز في تحفة الأخيار ص٣٩.

[٤٩]) الحاكم وصححه ووافقه الذهبي ٥٤٥/١ وانظر صحيح الترغيب والترهيب ٢٧٣/١.

[٥٠]) : وە ئێواران بڵێ : امسينا على فطرة الإسلام.

[٥١]) احمد ٤٠٦/٣و٤٠٧ وابن السني في عمل اليوم والليلة برقم ٣٤ وانظر: صحيح الجامع ٢٠٩/٤.

واتە : بەیانیمان بەسەردا هات لەسەر فیترەتی ئیسلام و ووشەی دڵسۆزی و ئیخلاص کە بریتی یە لە (لا إله إلا الله)، وە دینی پێغەمبەرمان محمد ﷺ و لەسەر میللەتی باوکمان ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) کە لای دابوو لە بەتاڵەوە بۆ هەق و موسڵمان بووەو لە هاوبەش دانەران نەبووە.

١٣) {سُبحانَ اللهِ وَبِحَمدهِ} سەد جار.[٥٢]

واتە : تەواوی و بێ کەم و کوڕی و سوپاس و ستایش بۆ خوایە.

١٤) {لا إلهَ إلّا الله وَحْدَهُ لا شَريكَ لَه، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْد، وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَديرٍ} (دە جار)[٥٣] یان (یەك جار لە کاتی بێ توانایيدا)[٥٤].

[٥٢] هەر کەسێ بەیانیان (سەد) جارو ئێواران (سەد) جار بیڵێ لە ڕۆژێکدا کەس لە ڕۆژی دوایی دا بەکردەوەی لەم باشترەوە نایەت مەگەر کەسێك وەك ئەمی وتبێ یان ذیکری زیاتری وتبێ. مسلم ٢٠٧١/٤.

[٥٣]) هەر کەسێك (١٠) جار دوای نوێژی بەیانی بیڵێ ئەوا (١٠) چاکەی بۆ دەنووسرێ و (١٠) خراپەی لەسەر لادەچێ و (١٠) پلە بەرزدەبێتەوە. وە بە ئەندازەی ڕزگارکردنی دوو کۆیلە لە نەوەکانی ئیسماعیل پێغەمبەر (علیه السلام) چاکەی پێ دەگات. وە ئێوارانیش بیڵێ هەروەهایە، وە دەبێتە پارێزەرێك بۆی لە شەیتان تاکو ڕۆژی لێ دەبێتەوە.

النسائي في عمل اليوم والليلة برقم ٢٤ وانظر: صحيح الترغيب والترهيب ٢٧٢/١، وتحفة الأخيار لابن باز ص٤٤ وانظر فضلها في ص١٤٦، حديث رقم ٢٥٥.

[٥٤]) هەر کەسێك بەیانیان (یەك) جار بیڵێ خوای گەورە بە ئەندازەی ئەو کەسە خێری بۆ دەنووسێ کە بەندەیەکی ڕزگار کردبێ لە نەوەکانی ئیسلام پێغەمبەر ﷺ. وە (١٠)

**واتە : هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە (الله) تاكی بێ هاوبەشەو موڵك و سوپاس هەر بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێكدا بە توانایە.**

**١٥)** {سُبْحانَ اللهِ وَبِحَمْدِهِ: عَدَدَ خَلْقِهِ، وَرِضا نَفْسِهِ، وَزِنَةَ عَرْشِهِ وَمِدادَ كَلِماتِهِ}(**تەنها بەیانیان سێ جار**) [٥٥].

**واتە : پاكی و بێ كەم و كورتی و گەورەیی سوپاس بۆ خوای گەورە: بە ئەندازەی ژمارەی دروستكراوەكانی و ڕەزای خۆی و قورسایی و سەنگینی عەرشەكەی و زۆرو درێژی ووشەكانی.**

**١٦)** {أَعُوذُ بِكَلِماتِ اللهِ التَّامَّاتِ مِن شَرِّ ما خلَق} (**سێ جار تەنها ئێواران**)[٥٦].

**واتە : پەنا ئەگرم بە ووشە تەواوەكانی خوای گەورە لە خراپەی دروستكراوەكانی.**

---

خراپەی لەسەر لادەبات و (١٠) پلە بەرزی دەكاتەوەو پارێزراو دەبێت لە شەیتان هەتا ئێوارەی لێ دەبێتەوە. وە ئەگەر ئێوارە بیلێ بەو جۆرەیە هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە.

ابو داود ٣١٩/٤ وابن ماجه واحمد ٦٠/٤ وانظر: صحيح الترغيب والترهيب ٢٧٠/١، صحيح ابو داود ٩٥٧/٣، وصحيح ابن ماجه ٣٣١/٢ وزاد المعاد ٣٧٧/٢.

[٥٥] مسلم ٢٠٩٠/٤.

[٥٦] هەر كەسێ ئێواران سێ جار بیلێ ئەوا ئەو شەوە پێوەدان زیانی پێ ناگەیەنێ: اخرجه احمد ٢٩٠/٢، والنسائي في عمل اليوم والليلة برقم ٥٩٠ وابن السني برقم ٦٨ وانظر: صحيح الترمذي ١٨٧/٣، وصحيح ابن ماجه ٢٦٦/٢ وتحفة الأخيار ص٤٥.

# خواردن و خواردنەوە

پێش خواردن بڵێ (بسم الله) واتە : بەناوی خوا . بەڵام ئەگەر بیرت چوو ئەوا هەر کاتێ بیرت کەوتەوە بڵێ: (بِسْم الله فِي أولِه وآخِرِه)[٥٧].

واتە : بەناوی خوای گەورە لەسەرەتاو کۆتایی دا.

بەڵام ئەگەر شیرت خواردەوە لەسەرەتادا بڵێ : ﴿اللهُمَّ بارك لَنا فيه وزدنا منْه﴾[٥٨].

واتە : خوایە بەرەکەت بڕژێنە بەسەرماندا لەمەداو لەمەمان بۆ زیاد بکە.

وە بەدەستی ڕاستت و لەبەردەمی خۆتەوە بخۆ[٥٩].

وە بە سێ پەنجەی گەورەو شایەتمان و ناوەڕاست بخۆو دوایی (پێش دەست سڕین) هەرسێکیان بلێسەرەوە.[٦٠]

وە قاپەکەشت بلێسەرەوەو هەرچییەکت لەدەست کەوتە خوارەوە لەپارو هەڵی بگرەوەو پاکی بکەرەوەو بیخۆو فڕێ ی مەدە بۆ شەیتان)[٦١].

---

[٥٧] اخرجه ابوداود ٣/٣٤٧ والترمذي ٤/٢٨٨ وانظر صحيح الترمذي ٢/١٦٧.

[٥٨] الترمذي ٥/٥٠٦ وانظر صحيح الترمذي ٢/١٥٨. چونکە لە شیر چاکتر نیە .

[٥٩] البخاري ٩/٤٥٨ ومسلم (٢٠٢٢).

[٦٠] مسلم (٢٠٣٢)، چونکە پێغەمبەری خوا ﷺ پێش دەست سڕین هەر سێ پەنجەکانی دەلێسایەوە.

[٦١] مسلم (٢٠٣٤).

وە (بەپێوە خواردنەوەو خواردن نەخۆیت).[٦٢]

وە بە ڕاکشانیشەوە خواردن مەخۆ[٦٣].

وە کە تەواو بوویت و لێ بوویتەوە بڵـێ : (الحمدُ لله الذي أطعمني هذا ورزقنيه من غير حول منّي ولا قُوّة).[٦٤]

واتە : سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئـەم خواردنـەی دامـێ و ڕزق و ڕۆزی دام بەبێ گۆڕان و توانای خۆم.

وە ئەگەر ئاو یان شیرت خواردەوە بە دانیشتنەوە بیخۆرەوە.[٦٥]

---

[٦٢] مسلم (٢٠٢٤) – (١١٣) .

[٦٣] چونکە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : (لا آكلُ مُتَّكِئاً) رواه البخاري (٤٧٢/٩)
ئیمامی الخطابي دەفەرمووێت : مەبەست بە (المُتكِيء) لێرەدا بریتی یە لە دانیشتن لەسەر پارچە دۆشەك و شتی نەرم. وە مەبەستی ئەوەیە کەوا لەسەر ئەو پارچە قوماشانە دانانیشێ وەکو کەسێك بیەوێ زۆر بخوات بە ئیسراحەت، بەڵکو بە شێوەیەکی لەسەر پەلەیی دائەنیشێ و بەپێ ی پێویست دەخوات. ئەمە ووتەی (الخطابي)یە.
وە غەیری ئەویش ئاماژە دەکەن بەوەی کە (المُتكِيء): ئەو کەسەیە کە ڕاکشاوەو لەسەر تەنیشتی کەوتووە. والله اعلم/ بڕوانە ریاض الصالحین (ص/٢٦٥).

[٦٤] هەر کەسێ ئەمە بڵێ خوا لە گوناهەکانی ئەوە پێشی خۆش دەبێ، اخرجه اصحاب السنن الاربع إلا النسائي وانظر صحيح الترمذي ١٥٩/٣. وصحيح سنن ابي داود ٧٦٠/٢ وهو حديث حسن.
بەلاّم وەك تێبینی یەك فەرموودەی : (الحمد لله الذي اطعمنا وَسَقانا وجَعَلَنا مُسلمين) فەرموودەیەکی زەعیفە. (بڕوانە تخريج الكلم الطيب لاپەڕە ١٨٨).

[٦٥] مسلم (٢٠٢٤) – (١١٣).

وە (هەناسەی لەسەر مەدەو فووی لێ مەکە).[٦٦] وە (سێ هەناسە بدە لە دەرەوەی جامەکە لە کاتی خواردنەوەدا)[٦٧].

وە (ئەو کەسەی کە ئاو دەگێڕێت با خۆی کۆتا کەس بیخواتەوە)[٦٨]. وە (ئەگەر حەزت لە خواردنێك نەبوو عەیبی لێ مەگرەو یان بیخۆ یان وازی لێ بێنە).[٦٩]

ئادەمیزاد هیچ دەفرێکی پڕ نەکردووە لە ورگی خراپتر بێت، وە چەند پاروویەك بەسە بۆ مرۆڤ کە پشتی ڕاگیر بکات ئەگەرنا با سێ یەکی گەدەی دابنێ بۆ خواردن و سێ یەکی بۆ خواردنەوەو سێ یەکی بۆ هەناسە.[٧٠]

وە ئەگەر مێشێك کەوتە ناو خواردنەوەی یەکێکتانەوە با هەمووی نوقم بکات و دەری بهێنێتەوە تیادا. چونکە لە باڵێکی دا دەردو لە باڵەکەی تری دا دەرمان هەیە.[٧١]

---

[٦٦] الترمذي (١٨٨٩) وقال : حديث حسن صحيح، واخرجه ابو داود (٣٧٢٨) وابن ماجه (٣٤٢٨) وإسناده صحيح عن ابن عباس (رضي الله عنهما).

[٦٧] البخاري ١٠/٨١، ومسلم (٢٠٢٨).

[٦٨] الترمذي (١٨٩٥) وقال : حديث حسن صحيح . واخرجه مسلم (٦٨١) في حديث مُطَوَل.

[٦٩] چونکە پێغەمبەر ﷺ هەرگیز عەیبی لە خواردن نەگرتووە/ البخاري ٤٧٧/٩ ومسلم (٢٠٦٤).

[٧٠] رواه الامام احمد والترمذي (٢٣٨١) والنسائي وابن ماجه وقال الترمذي: حديث حسن، عند المقدام بن معد يكرب رضي الله عنه . انظر اربعين النووية.

[٧١] اخرجه البخاري والدارمي وابن ماجه واخرون والزيادة للبخاري. انظر سلسلة الاحاديث الصحيحة رقم (٣٨).

تێبینی : دەست نوێژگرتن پێش نان خواردن سوننەتە بۆ کەسی لەش گران.[٧٢]

## نزاو پاڕانەوەی میوان بۆ خاوەن ماڵ

(اللهُمَّ بارِكْ لَهُمْ فِيما رَزَقْتَهُم واغفِرْ لَهُم وارحَمْهُم)[٧٣]

واتە : خوایە بەرەکەت بخەرە ئەو ڕۆزی یەی داوتنەتێ و لێ یان خۆش بەو بەزەیت پیێ یان دا بێتەوە.

## داماڵین و داکەندنی پۆشاک و جل

پەردەی نێوان چاوی جنۆکەو داوێن (عەورەتی) ئادەمیزاد ئەوەیە کە کاتێ یەکێکیان پۆشاکی دانا بڵێ (بسم الله)[٧٤].

---

[٧٢] رواه ابو داود ١/٣٧٥ / ٢٢٢ وانظر سلسلة الاحاديث الصحيحة (١/٦٧٤) رقم الحديث (٣٩٠).

[٧٣] مسلم ٣/١٦١٥.

[٧٤] رواه الطبري في الأوسط وصححهُ الألباني (صحيح الجامع ٣/٢٠٣).

## چوونە سەر ئاو

**لە پێش چوونە ژوورەوە بڵێ :** {(بِسْمِ اللهِ) اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْخُبْثِ وَالْخَبَائِثِ}[75].

**واتە : بەناوی خوا، خوایە پەنات پێ ئەگرم لە شەیتانە نێرەو مێ یەكان.**

**وە كە هاتیتە دەرەوە بڵێ : (غُفرانَكَ)[76]**

**واتە : خوایە لێم خۆش بە -ماوەیەكە یادی تۆم نەكرد-.**

**تێبینی : زانایان پێیان وایە چاك وایە لە پێش دا قاچی چەپ پێش بخرێت بۆ چوونە ژوورەوەو قاچی ڕاستیش پێش بخرێت بۆ هاتنە دەرەوە.**

---

[75]) اخرجه البخاري ٤٥/١ ومسلم ٢٨٣/١ (الخُبْث) به سكونی سەر (باء)ەكەو بە چەمەش دەخوێندرێتەوە، وە بە زیادەی (بسم الله) لەو فەرموودەیەدا نی یە بەڵكو (اخرجها سعيد بن منصور . انظر فتح الباري ٢٤٤/١.

وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرموویێت : (پەردەی نێوان چاوی جنۆكەو داوێنی ئادەمیزاد ئەوەیە كە كاتێ چووە سەر ئاو بڵێ (بسم الله) رواه الطبراني في الاوسط وصححه الالباني (صحيح الجامع ٢٠٣/٣).

[76] ابو داود ٣٠/١ رقم (٣٠) والترمذي ١٢/١ رقم (٧) وقال : حديث حسن غريب، وابن ماجه ١١٠/١ رقم (٣٠٠). وصحَحَهُ الألباني في صحيح ابي داود برقم (٢٣).

## جل و بەرگ لەبەر کردن

**لە پێش دا لای ڕاست لەبەر بکە،**[٧٧] **وە بڵێ :** {الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي كَسَانِي هَذَا وَرَزَقَنِيهِ مِنْ غَيْرِ حَوْلٍ مِنِّي وَلَا قُوَّةٍ...}[٧٨].

**واتە : ستایش بۆ ئەو خوایەی کە ئەم پۆشاکەی پۆشیم و پێ ی بەخشیم بەبێ هیچ گۆڕان و توانای خۆم.**

## لەبەر کردن و پۆشینی جل و بەرگی نوێ

{اللَّهُمَّ لَكَ الْحَمْدُ أَنْتَ كَسَوْتَنِيهِ أَسْأَلُكَ خَيْرَهُ وَخَيْرَ مَا صُنِعَ لَهُ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ شَرِّهِ وَشَرِّ مَا صُنِعَ لَهُ}[٧٩].

**واتە : خوایە ستایش بۆ تۆیە تۆ پۆشیمت و پۆشتەت کردم، داوای چاکەی ئەو پۆشاکەت لێ ئەکەم (کە بریتی یە لە مانەوە لە ژیاندا) وە داوای ئەو خێرو چاکەیەت لێ دەکەم کە بۆی دروست کراوە (کە بریتی یە لە لادانی بەلای ئەو کارەدا کە ڕەزامەندی خوای گەورەی تیایە)، وە**

---

[٧٧] ابو داود (٤١٤١) وسنده صحيح واخرجه الترمذي (١٧٦٦) وصححه ابن حبان (١٤٧). وهو حديث صحيح. انظر زاد المعاد ٣٨٧/٢ وصحيح الترمذي ٥/١.

[٧٨]) اخرجه اهل السنن إلا النسائي انظر:إرواء الغليل ٤٧/٧.

[٧٩]) ابو داود والترمذي والبغوي وانظر مختصر شمائل الترمذي للألباني ص٤٧.

پەنات پێ ئەگرم لە خراپەی و ئەو خراپەیەی بۆی دروست کراوە (کە بریتی یە لە لادانی بەلای ئەوەی بەخۆ بەزل زانین و فیزەوە لەبەری بکات).

## ئەگەر یەکێك بەرگی نوێ ی لەبەر کردبوو

{الْبَسْ جَدِيدًا،وَعِشْ حَمِيدًا،وَمُتْ شَهِيدًا}(٨٠).

واتە : یاخوا پۆشاکی تازە لەبەر بکەیت و بە سوپاس کراوی بژیت و بە شەهیدی سەرنیێتەوەو بمریت.

## لەپێ کردنی نەعل و پێڵاو

لە پێشدا لای ڕاست لە پێ بکەو لەکاتی داکەندندا لای چەپ دابکەنە.[٨١]

وە پێغەمبەری خوا ﷺ نەهی کردووە لە لەپێ کردنی نەعل بە پێوە.[٨٢] وە بە یەك تاکەوە مەڕۆ بەڕێ دا. یان هەردووکی لە پێ بکە یان هەردووکیان دابکەنە.[٨٣]

---

[٨٠] ابن ماجه ٢/١١٧٨ والبغوي ١٢/٤١ وانظر صحيح ابن ماجه ٢/٢٧٥.
[٨١] البخاري ١٠/٢٦٣، ومسلم (٢٠٩٧).
[٨٢] ابو داود (٤١٣٥) بإسناد حسن عن جابر ورجاله ثقات وهو حديث صحيح بشواهده عن ابي هريرة وعبدالله بن عمر وانس (رضي الله عنهم).
تێبینی :

# گەڕانەوە بۆ ماڵ

خوای گەورە دەفەرمووێت : ﴿ فَإِذَا دَخَلْتُم بُيُوتًا فَسَلِّمُوا عَلَىٰ أَنفُسِكُمْ تَحِيَّةً مِّنْ عِندِ اللَّهِ مُبَارَكَةً طَيِّبَةً ﴾ النور: ٦١.

واتە : ئەگەر چوونە ماڵێکەوە سڵاو لە یەکتری و خۆتان بکەن بە سڵاوێکی خوایی پیرۆزو بەفەڕو پاك.[٨٤]

پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرمووێت : (سێ کەس هەموویان مسۆگەر زامنن لەژێر چاودێری خوای گەورەدا ...) وە لەوانە (رجُلٌ دَخَلَ بيتَهُ بِسَلامٍ فهُوَ ضامِنٌ على الله عزَّ وَجل)[٨٥]

---

ئیمامی (المناوي) دەفەرمووێت : فەرموودەکە بۆ ڕێ نیشاندان و ئیرشادە . چونکە بە دانیشتنەوە لە پێ کردنی ئاسان ترە. بۆیە ئیمامی (الطيبي) وە غەیری ئەو نەهی یەکەیان تایبەت کردووە بە لەپێ کردنی ئەو پێڵاوەی کە لە پێ کردنی بە پێوە ناڕەحەتەوەو ماندووت دەکات وەکو (ناسومەو خوف) (کە قەیتانی هەیە) نەك (قابقاب و سرموزە) وە خوای گەورەش زاناترە بە حیکمەتی تەشریع و نەهی یەکانی / بڕوانە سلسلة الصحيحة للألباني (٢/٣٥٠).

[٨٣] البخاري ١٠/٢٦٢، ١٦١، ومسلم (٢٠٩٧).

[٨٤] تفسير القرآن العظيم ٣/٢٧٠ – ٢٧١.

[٨٥] صحيح (صحيح سنن ابي داود ٢/٤٧٢) وە لە فەرموودەی صەحیح دا هاتووە : (ئەگەر پیاوێك گەڕایەوە ماڵەوەو یادی خوای گەورە کرد لە کاتی چوونە ژوورەوەو نان خواردنی دا، ئەوە شەیتان بە هاوەڵەکانی دەڵێت : لێرە نەجێگەو نەشێو و خواردنتان نیە ) مسلم ژمارە (٢٠١٨).

واتە : پیاوێك بگەڕێتەوە ماڵەوە بە سڵاو کردن زامنە لەلایەن خواوە.

وە عائیشە (ڕەزای خوای لێ بێـت) دەفـەرموێت : پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگەر بگەڕایەتەوە ماڵەوە بە سـیواك دەسـتی پـێ دەکـرد –واتـە : یەکەم شت سیواکی دەکرد– .[86]

## لەکاتی ڕۆیشتن دا بەرەو مزگەوت

{اللَّهُمَّ اجْعَلْ فِي قَلْبِي نُورًا، وَفِي لِساني نُوراً، واجْعَلْ فِي سَمْعِي نُورًا واجْعَلْ فِي بَصَرِي نُورًا، واجْعَلْ مِن خَلفي نُوراً، وَمِنْ أمامي نوراً . واجعَلْ مِنْ فوقِي نوراً وَمِنْ تحتي نوراً. اللهُمّ أعطِني نوراً}[87].

واتە : خوایە نور بخەیتە دڵ و زوبان و بیستن و بینین و پاش و پێش و سەرو خوارەوەم. سا خوایە نورم پێ ببەخشی.

[86] صحيح مسلم / كتاب الطهارة باب ١٥/رقم (٤٤).
[87] رواه مسلم ٦/٥١ وابن خزيمة في صحيحة (٤٤٨).

## چوونە ناو مزگەوت

{أَعُوذُ بِاللَّهِ الْعَظِيمِ وَبِوَجْهِهِ الْكَرِيمِ وَسُلْطَانِهِ الْقَدِيمِ مِنَ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ}[٨٨]. [بِسْمِ الله، وَالصَّلاةُ ][٨٩]، [وَالسَّلامُ عَلى رَسُولِ الله][٩٠]. {اللَّهُمَّ افْتَحْ لِي أَبْوَابَ رَحْمَتِكَ}[٩١].

**واتە: پەنا ئەگرم بەخوای مەزن و بەڕووی بەڕێزی و دەسەڵاتی هەربووی بەردەوامی لە شەیتانی نەفرەت لێ کراوی لە ڕەحمەت دەرکراو. بەناوی خوای گەورەو درودو سڵاو لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ. خوایە دەرگاکانی ڕەحمەتی خۆتم لێ بکەرەوە.**

## هاتنە دەرەوەلە مزگەوت

{بِسْمِ اللهِ وَالصَّلاةُ وَالسَّلامُ عَلى رَسُولِ الله، اللّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ مِن فَضْلِكَ، اللَّهُمَّ اعْصِمْنِي مِنْ الشَّيْطَانِ الرَّجِيمِ}[٩٢].

---

[٨٨]) ئەگەر ئەمە بڵێ شەیتان دەڵێ : بەدرێژایی هەموو ڕۆژەکە پارێزراوە لێم. حديث صحيح (انظر صحيح سنن ابي داود ٩٣/١) وانظر صحيح الجامع برقم ٤٥٩١.

[٨٩]) رواه ابن السني برقم ٨٨ وحسنه الألباني.

[٩٠]) ابو داود ١٢٦/١، وانظر صحيح الجامع ٥٢٨/١.

[٩١]) مسلم ٤٩٤/١.

[٩٢]) بڕوانە تەخریجی ڕیوایەتەکەی فەرموودەی چوونە ناو مزگەوت، وە زیادەی {اللهم اعصمني من الشيطان الرجيم} لابن ماجه، انظر صحيح ابن ماجه ١٢٩/١.

واتە: بەناوی خوا، درودو سلاو لەسەر پێغەمبەری خوا ﷺ، خوایە من داوای فەزڵی خۆتت لێ دەکەم. خوایە بمپارێزە لە شەیتانی نەفرەت لێ کراو.

تێبینی : بۆ چوونە مزگەوت قاچی ڕاست پێش دەخرێت، بەلام بۆ هاتنە دەرەوە قاچی چەپ پێش دەخرێت.

## بینینی ئەو کردەوانەی کە لە مزگەوتدا دروست نین

ئەگەر کەسێك لە مزگەوتدا جاڕی بۆ شتێکی وون بوو ئەدا پێ ی بڵێ : (لا رَدَّهَا اللهُ عَلَيكَ).

واتە : خوا بۆت نەگەڕێنێتەوە.

وە ئەگەر بینیت کڕین و فرۆشتن دەکرا لە مزگەوتدا پێ ی بڵێ :

(لا أربَحَ اللهُ تِجارَتَكَ)[٩٣].

واتە: خوای گەورە قازانج نەخاتە ناو ئەو بازرگانی یەتەوە، چونکە مزگەوت بۆ ئەوە نەکراوە.

[٩٣] الترمذي (١٣٢١) وقال حديث حسن. والدارمي ١/٣٢٦ وصحَّحَهُ ابن حبان (٤١٣) والحاكم ٢/٥٦ ووافقه الذهبي عن ابو هريرة رضي الله عنه.

وە دروست نی یە تف و بەڵغەم و چڵم و شتی پیس ڕۆبکرێتە ناو مزگەوت چونکە تاوانەو کەفارەتەکەشی پاك کردنەوەیەتی.[94]

وە نەهی کراوە لەوەی کە شیعری ناجائیزی تێدا بووترێت.[95]

هەروەها دروست نیە دەنگ بەرز کردنەوە تیایدا.[96] وە هەر کەسێك پیاز یان سیر یان کەوەر (یان توور یان شتی بۆن ناخۆشی تری خوارد) با نزیکی مزگەوت نەکەوێتەوە. چونکە مەلائیکەتەکان ئەزێت ئەچێژن بەو شتەی کە مرۆڤ ئەزێتی پیێ دەگا.[97]

## پێش دەست نوێژ

بڵێ : {بِسْمِ اللهِ}[98].

تێبینی: ئەو ویردو زیکرانەی خەڵکی عەوام دەیڵێن لەکاتی شۆردنی هەر ئەندامێك لە ئەندامەکانی دەست نوێژدا هیچ بنچینەیەکی نی یەو لەو فەرموودەدا نەهاتووە.[99] وە هیچ دوعاو نزایەکی تایبەتیش نی یە بە کاتی دەست نوێژ شتنەوە.

---

[94] البخاري ١/٤٢٨، ومسلم (٥٢٢).

[95] ابو داود (١٠٧٩) والترمذي (٣٢٢) وقال حديث حسن. واخرجه النسائي ٢/٤٧-٤٨ وسنده حَسَن، عن عمرو بن شعيب عن ابيه عن جدهﷺ.

[96] البخاري ٧/٤٦٥.

[97] البخاري ٩/٤٩٨، ومسلم (٥٦٤).

[98]) ابو داود وابن ماجه واحمد وانظر إرواء الغليل ١ / ١٢٢. وصحيح الترمذي ١/١٠١.

[99] انظ الوابل الصيب ص(٣١٦) و الأذكار للنوي ١/١١٦.

## نزای دوای دەست نوێژ

**١)** {أَشْـهَد أَن لا إِلـه إِلاّ الله وَحْـدَه لا شَـريكَ لَـهُ وَأَشْـهَد أَنَّ مُحَمَّـداً عَبْـدُهُ وَرَسولُه..}[١٠٠].

**واتە : شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگـە لـە(الله) تاکی بێ هاوبەشەوە شایەتی دەدەم کە محمدﷺ بەندەو نێردراوی خوایە.**

**٢)** {اللَّهُمَّ اجْعَلْنِي مِنْ التَّوَّابِينَ وَاجْعَلْنِي مِنْ الْمُتَطَهِّرِينَ}[١٠١].

**واتە : خوایە بمگێڕی لە تەوبەکاران و بمگێڕی لە خۆپاك کەرەوەکان.**

**٣)** {سُبْحَانَكَ اللَّهُـمَّ وَبِحَمْـدِكَ أَشْـهَدُ أَنْ لَا إِلَـهَ إِلَّا أَنْـتَ أَسْـتَغْفِرُكَ وَأَتُـوبُ إِلَيْكَ}[١٠٢].

---

[١٠٠]) هەر کەسێك دەست نوێژی تەواو بشۆرێ و ئەمە بڵێ هەر هەشت دەرگاکەی بەهەشتی بۆ دەکرێتەوە لەکامیانەوە ئارەزوو بکات دەچێتە ناوی . مسلم ٢٠٩/١.

[١٠١]) الترمذي ٧٨/١ رقم (٥٥) وانظر صحيح الترمذي ١٨/١. وهو صحيح صَحَّحَهُ الألباني في سنن الترمذي رقم (٤٨).

[١٠٢]) هەر کەسێك دەست نوێژ بگرێ و پاشان ئەمە بڵێ لەلاپەڕەیەکدا بۆی دەنووسرێتەوە، پاشان مۆر دەکرێت بە مۆرێك ناشکێت تا ڕۆژی قیامەت. رواه الحاكم ٥٦٤/١ وهو صحيح وانظر النسائي في عمل اليوم والليلة ص١٧٣ وانظر إرواء الغليل ١٣٥/١و٩٤/٢. ورواه الحاكم ٥٦٤/١ انظر صحيح الترغيب والترهيب (٢٢٠).

واتە : پاکی و بێ گەردی و سوپاس بۆ تۆیە خوایە، شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە تۆ، داوای لێ خۆش بوونت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.

## وەلامدانەوەی بانگ بێژ

١) بانگ بێژ هەرچی یەکی ووت تۆش دەیلێیتەوە جگە لە ووتنی (حيَّ على الصَّلاه – حيَّ على الفَلاح) کە دەبێ بلێ ی : {"لا حَوْلَ وَلا قُوَّةَ إلاّ بِالله}[١٠٣].

٢) وە بلێ : {وَأَنا أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ وَأَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ رَضِيتُ بِاللَّهِ رَبًّا وَبِمُحَمَّدٍ رَسُولًا وَبِالْإِسْلَامِ دِينًا}[١٠٤].

ئەمە دوای شایەتمانی بانگ بێژ دەوترێت.[١٠٥]

---

١٠٣ ) هەر کەس ئاوا لە دلی یەوە بیلێ دەچێتە بەهەشتەوە . البخاري ١٥٢/١ ومسلم ٢٨٨/١.

١٠٤ ) هەر کەسێ کە گوێ ی لە بانگ بێژبوو بیلێ خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ/ مسلم ٢٩٠/١.

١٠٥ ابن خزيمة ٢٢٠/١.

# دوای بانگ

**١) دوای وەلاّم دانەوەی بانگ بێژ صلاّوات بدە لەسەر پێغەمبەر ﷺ.[١٠٦]**

**٢) پاشان بڵێ :**

{اللَّهُـمَّ رَبَّ هَـذِهِ الـدَّعْوَةِ التَّامَّـةِ وَالصَّـلَاةِ الْقَائِمَـةِ آتِ مُحَمَّـدًا الْوَسِـيلَةَ وَالْفَضِيلَةَ وَابْعَثْهُ مَقَامًا مَحْمُودًا الَّذِي وَعَدْتَهُ، (إِنَّكَ لا تُخْلِفُ الميعاد)}[١٠٧].

**واتە : خوایە پەروەردگاری ئەم بانگـەوازە تـەواو و نوێـژە دامـەزراوە. ببەخشە بـە پێغەمبـەرمان محمـد ﷺ پلـەی بـەرزی (الوسیلة) (کـە شوێنێکە لە بەهەشـت دایـە بـۆ کـەس نـابێ جگـە لـە بەندەیـەك لـە بەندەکانی خوای گەورە، وە پێغەمبەر ﷺ فەرموویـەتی : ئومێـدم وایـە کە ئەو کەسـە مـن بم) وە (الفضیلة) کـە پلەیـەکی زیادەیـە بەسـەر دروست کراواندا. وە بیبەرە ئەو شوێنە سوپاس کراوەی کـە بـەڵێنت پـێ داوە (کەپلەی شەفاعەتی گەورەیە لە ڕۆژی دوایی دا).**

---

[١٠٦] مسلم ١/٢٨٨. بۆ شێوازی صلاّوات .

[١٠٧]) هەر کەسێك ئەم پاڕانەوەیە بڵێ کاتێ بانگ دەبیستێ بەر شەفاعەتی پێغەمبەر ﷺ دەکەوێت، البخاری ١/١٥٢، وە زیادەی (انكَ لا تُخْلِفُ المِعادَ) للبیهقي ١/٤١٠ و (العلامة ابن باز) لە (تحفة الاخیار) ص ٣٨ ئیسنادەکەی بەحەسەن داناوە. بەلاّم زیادەیە ضەعیفە هەروەك هاتووە لە الإرواء ١/٢٦٠ وە (الفتح)دا.

٣) بپاڕێرەوە بۆ خۆت لەنێوان بانگ و قامەت دا. چونکە پاڕانەوەی ئەو کاتە ڕەت ناکرێتەوە.[١٠٨]

## فەزڵی بانگ وتن

١) بانگ بێژ لە ڕۆژی دوایی دا لە هەموو کەسێك گەردن و ملی بەرزو درێژترە.[١٠٩]

٢) وە هەموو شتێك لە مرۆڤ و جنۆکەو شتی تر شایەتی بۆ دەدەن لە ڕۆژی دوایی دا.[١١٠]

٣) وە هەر موسڵمانێك (١٢) ساڵ بانگ بدات (بەبێ بەرانبەر) ئەوا بەهەشتی بۆ واجب دەبێ و بە هەموو بانگێك لە ڕۆژێکدا (٦٠) چاکەو بە هەموو قامەتێك (٣٠) چاکەی دەست گیر دەبێ.[١١١]

[١٠٨] رواه البخاري ٥١٧/٢٤٤/٨. وانظر صحيح ابو داود (٤٨٩).

[١٠٩] مسلم ٣٨٧ عن معاوية ﷺ.

[١١٠] البخاري ٧٢/٢، ٧٣.

[١١١] حيث حسن. اخرجه ابن ماجه رقم (٧٣٨) والدارقطني والحاكم والبيهقي عن ابن عمر ﷺ، انظر (تخريج الاذكار) لابن حجر العسقلاني جزء١/ وصححهُ الألباني في السلسلة الصحيحة ١٦/١.

## سوونەتی دەست پێکردنی نوێژ (الإستفتاح)

{وَجَّهْتُ وَجْهِيَ لِلَّذِي فَطَرَ السَّمَوَاتِ وَالْأَرْضَ حَنِيفًا وَمَا أَنَا مِنْ الْمُشْرِكِينَ إِنَّ صَلَاتِي وَنُسُكِي وَمَحْيَايَ وَمَمَاتِي لِلَّهِ رَبِّ الْعَالَمِينَ لَا شَرِيكَ لَهُ وَبِذَلِكَ أُمِرْتُ وَأَنَا مِنْ الْمُسْلِمِينَ}[١١٢].

**واتە: بە پاکی و دڵسۆزی ڕووم کردە ئەو خوایەی ئاسمانەکان و زەوی بەدیهێناوەو من لە هاوبەش دانەران نیم. بەڕاستی نوێژو سەربڕین و ژیان و مردنم تەنها بۆ پەروەردگاری جیهانیانەو بەوە فەرمانم پێ کراوەو من لە موسڵمانانم.**

## نزای چەمینەکان (الرُّکوع)

**١) (سُبحان ربِّيَ العَظيم) سێ جار.[١١٣]**

**واتە : پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ پەروەردگاری مەزنمە.**

**٢)** {سُبْحانَكَ اللّهُمَّ رَبَّنا وَبِحَمْدِكَ اللّهُمَّ اغْفِر لِي}[١١٤].

---

[١١٢]) اخرجه مسلم ٥٧/٦.

[١١٣] اخرجه اهل السنن واحمد. وانظر صحيح الترمذي ٨٣/١. وە زیادەی (وبحمدهِ) صەحیحە بڕوانە (صفة صلاة النبي ﷺ ص/١٣٣) الطبعة الثانية من الجديدة ١٤١٧ هـ - ١٩٩٦م.

[١١٤]) البخاري ٩٩/١ ومسلم ٣٥٠/١.

**واتە : پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ تۆیە پەروەردگارم سوپاس و ستایش لایەقی تۆیە. ساخوایە لێم خۆش بە.**

**٢)** {سُبُّوحٌ، قُدُّوس، رَبُّ الملائِكَةِ وَالرُّوح}[١١٥].

**واتە: ئەی خودایە پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ تۆیە پەروەردگاری مەلائیکەتان و ڕۆح.**

## نزای هەستانەوە لە چەمینەوەکان

**١)** {سَمِعَ اللهُ لِمَنْ حَمِده}[١١٦].

**واتە : خوای گەورە ستایشی ئەو کەسەی بیست کە ستایشی کردو سوپاس و پێ زانینی بۆ دەربڕیوە.**

**٢)** {رَبَّنا وَلَكَ الحَمْد.[١١٧] حَمْداً كَثيراً طَيِّباً مُبارَكاً فِيهِ}[١١٨].

---

[١١٥]) مسلم ١/٣٥٣، وابو داود ١/٢٣٠.

[١١٦]) البخاري مع الفتح ٢/٢٨٢.

[١١٧] وە هەندێ جار دەڵێ : (ربّنا لَكَ الحَمْدُ) رواه البخاري برقم (٧٩٦) (کە هەر کەسێك لەدوای ئیمامەوە بیڵێ و ووتنی ئەم لەگەڵ ووتنی مەلائیکەتەکاندا یەکگیر ببێ، ئەوا خوای گەورە لە گوناهەکانی پێشووی خۆش دەبێ) وە هەندێ جار بۆ ئەم دووانە ووشەی (اللهُمّ) لە پێشی یەوە زیاد دەکات / مسلم ١/٣٤٦.

[١١٨]) کابرایەك ئەمەی فەرموو: پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : (کێ ئەمەی ووت؟ فەرمووی : من. فەرمووی : بینیم سی و ئەوەندە مەلائیکەت هەڵپەیان بۆ کرد تا کامیان بینوسن). البخاري مع الفتح ٢/٢٨٤. وە یان بڵێ : ( ..... مُباركاً عَلَيهِ كَما يُحِبُّ رَبنا وَيَرضَى)

## نزای کورنوشەکان (السّجود)

١) {سُبْحانَ رَبِّيَ الأَعْلى}(١١٩).

واتە: پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ پەروەردگاری زۆر بەرزم.

٢) {سُبُّوحٌ، قُدُّوس، رَبُّ المَلائِكَةِ وَالرُّوحِ}(١٢٠).

واتە : ئەی خوایە پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی و پیرۆزی لایەقی تۆیە پەروەردگاری مەلائیکەتەکان و ڕۆح.

## نزای دانیشتنی نێوان دوو کورنوشەکە

{رَبِّ اغْفِر لِي رَبِّ اغْفِر لِي}(١٢١).

واتە: پەروەردگار لێم خۆش بە. پەروەردگار لێم خۆش بە.

---

البخاري ٣١٧/١ ومالك وابوداود. وە هەندێ جار لە شەو نوێژدا دەڵێ (لِرَبِّيَ الحَمْدُ لِرَبِّيَ الحَمْدُ) ئەمە دووبارە دەکاتەوە/ رواه النسائي بسندٍ صحيح (الارواو ٣٣٥).

[119]) اخرجه اهل السنن واحمد وانظر صحيح الترمذي ٨٣/١. وە زیادەی (وَبحمدهِ) صەحیحە. بڕوانە (صفة صلاة النبي ﷺ ص ١٤٦).

[120]) مسلم ٣٥٣/١ وابو داود ٢٣٠/١.

[121]) ابو داود ٢٣١/١ رقم (٨٧٤) والنسائي ١٩٩/٣ و ابن ماجه ١٤٨/١ وصحّحَهُ الالباني في إرواء الغليل برقم (٣٣٥) وانظر صحيح ابن ماجه ١٤٨/١.

## نزای کورنوشی قورئان خوێندن (سُجودُ التِّلاوه)

{سَجَدَ وَجْهِي لِلَّذِي خَلَقَهُ وَشَقَّ سَمْعَهُ وَبَصَرَهُ بِحَوْلِهِ وَقُوَّتِهِ (فَتَبَارَكَ اللَّهُ أَحْسَنُ الْخَالِقِينَ)}[١٢٢].

**واتە: ڕووم کوڕنوشی برد بۆ ئەو خوایەی بەدی هێناوەو بیستن و بینینی بۆ داڕشتووە بە گۆڕین و توانای خۆی. پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ ئەو (الله)ی کە چاکترینی بەدی هێنەرانە.**

## تەحییات (التَشَهُد)

{التَّحِيَّاتُ لِلَّهِ وَالصَّلَوَاتُ وَالطَّيِّبَاتُ السَّلَامُ عَلَيْكَ أَيُّهَا النَّبِيُّ[١٢٣] وَرَحْمَةُ اللَّهِ وَبَرَكَاتُهُ السَّلَامُ عَلَيْنَا وَعَلَى عِبَادِ اللَّهِ الصَّالِحِينَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَأَشْهَدُ أَنَّ مُحَمَّدًا عَبْدُهُ وَرَسُولُهُ}[١٢٤].

---

[١٢٢]) الترمذي ٢/٤٧٤ واحمد ٦/٣٠ والحاكم وصححه ووافقه الذهبي ١/٢٢٠ والزيادة له.

[١٢٣] ئەمە دەقی فەرموودەیەکی پێغەمبەرە ﷺ، بەڵام دوای وەفاتی پێغەمبەری خوا ﷺ هاوەڵەکان (ڕەزای خوایان لەسەر بێ) دەیان فەرموو: (السلام على النبي ورحمة الله وبركاته). يقول ابن عثيمين في شرح بلوغ المرام : هذا إجتهاد ابن مسعود رضي الله عنه لكنه في مقابلة النص والنبي ﷺ علم امته ان يقول هذا ولم يفرق بين حياته وموته ولا بين الحاضرين معه في المسجد والغائب. (رواه البخاري). فتح الباري (٢/٣٩٩) رقم الحديث (٣٩٩) وانظر صلاة النبي ﷺ ص ١٦٢.

[١٢٤]) البخاري مع الفتح ١/١٣ ومسلم ١/٣٠١.

واتــە : (موڵــك و مانــەوەو گــەورەیی) (دوردو پاڕانــەوەو لالأنەوە)و ووشەی پاك و چاك هەر بۆ خوایە. سلاّو و ڕەحمەت و بەرەکـەتی خـوات لەسـەر بـێ ئـەی پێغەمبـەری خـوا ﷺ. سـلاّو لەسەر ئێمەش و لەسـەر هـەموو بەنـدە چاکەکانی خوای گەورە. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە (الله). وە شایەتی دەدەم کە محمد ﷺ بەندەو نێردراوی خوایە.

## صلاّوات دان لەسەر پێغەمبەر ﷺ لە دوای تەحییات

{اللَّهُمَّ صَلِّ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا صَلَّيْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ اللَّهُمَّ بَارِكْ عَلَى مُحَمَّدٍ وَعَلَى آلِ مُحَمَّدٍ كَمَا بَارَكْتَ عَلَى إِبْرَاهِيمَ وَعَلَى آلِ إِبْرَاهِيمَ إِنَّكَ حَمِيدٌ مَجِيدٌ}[١٢٥].

واتــە: خوایــە دروودو ڕەحمــەت بڕێــژە بەســەر محمــد ﷺ و خانــەوادەو کــەس و کــاری محمــد ﷺ . هــەروەك درودت ڕژان بەســەر ئیــبڕاهیم و کــەس و کــاری ئیــبراهیم (علیــە الصــلاة والسلام). بەڕاستی تـۆ سوپاس کراو و خـاوەن سکۆو بـەرزیت. خوایـە فـەڕو پـیرۆزی بڕێـژە بەسـەر محمـد ﷺ و کـەس و کـاری محمد ﷺ دا. هەروەك فەڕو پیرۆزیـت ڕژانـدوە بەسـەر ئیـبڕاهیم و

[١٢٥]) البخاري مع الفتح ٤٠٨/٦.

کەس و کارەکەی دا (علیه الصلاة السلام) بە ڕاستی تۆ سوپاس کراوو خاوەنی شکۆو بەرزیت.

## نزای پاش تەحییاتی کۆتایی و پێش سڵاودانەوە

١) {اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ وَمِنْ عَذَابِ جَهَنَّم، وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا وَالْمَمَاتِ وَمِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ}[١٢٦].

واتە : خوایە پەنات پێ ئەگرم لە سزای گۆڕو سزای دۆزەخ و ئاشوبەی ژیان و مردن و خراپەی ئاشووبەی چاو سڕاوەی هەق داپۆشەر (المسیح الدَّجال).

٢) {اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ عَذَابِ جَهَنَّم، و مِنْ فِتْنَةِ الْمَسِيحِ الدَّجَّالِ وَأَعُوذُ بِكَ مِنْ فِتْنَةِ الْمَحْيَا والممات. اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْمَأْثَمِ وَالْمَغْرَمِ}[١٢٧].

واتە : خوایە پەنات پێ ئەگرم لە سزای گۆڕو پەنات پێ ئەگرم لە ئاشوبەی مەسیحی دەجال و پەنات پێ ئەگرم لە ئاشوبەی ژیان و مردن. خوایە پەنات پێ ئەگرم لە گوناه و قەرزاری.

---

[١٢٦]) البخاري ١٠٢/٢ ومسلم ٤١٢/١ واللفظ لمسلم.

[١٢٧]) البخاري ٢٠٢/١ ومسلم ٤١٢/١.

٣) { اللَّهُمَّ إِنِّي ظَلَمْتُ نَفْسِي ظُلْمًا كَثِيرًا وَلَا يَغْفِرُ الذُّنُوبَ إِلَّا أَنْتَ فَاغْفِرْ لِي مَغْفِرَةً مِنْ عِنْدِكَ وَارْحَمْنِي إِنَّكَ أَنْتَ الْغَفُورُ الرَّحِيمُ }(١٢٨).

**واتە: خوایە من ستەمم لە نەفسی خۆم کردووە ستەمێکی زۆرو کەس لە گوناھ و تاوان خۆش نابێ جگە لە زاتی تۆ. ساخوایە لێم خۆش ببە بە لێ خۆشبوونی خۆت و ڕەحمم پێ بکە، بەڕاستی خۆت لێ بووردەو بەخشندەیت.**

## ویردی دوای سەلامدانەوەی نوێژ[١٢٩]

١) **سێ جار بڵێ : (استغفرُ الله) ئینجا بڵێ :** {اللَّهُمَّ أَنْتَ السَّلام، وَمِنْكَ السَّلام، تَبارَكْتَ يا ذا الجَلالِ وَالإِكْرام}(١٣٠).

**واتە: داوای لێ خۆشبوون لەخوا دەکەم. خوایە تۆ سەلامی و ئاشتی و سەلامەتیش لەتۆوەیە. پاکی و بێ عەیبی بۆ تۆیە ئەی خاوەنی شکۆو ڕێز.**

---

[١٢٨]) البخاري ١٦٨/٨ ومسلم ٢٠٧٨/٤.

[١٢٩] سەرەتا لەسەردەمی پێغەمبەردا ﷺ ئەو ویردانە بە دەنگی بەرز خوێندراوە بۆ ئەوەی خەڵکی فێری ببن پاشان بەدەنگی نزم و هەرکەسەو بۆخۆی خوێندونی، لەبەر ئەوە دروست نیە بۆ کۆڕس و بەدەنگی بەرز بخوێندرێن، بڕوانە (الفتح الباري).

[١٣٠]) مسلم ٤١٤/١.

٢) {لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ. اللهُمَّ لا مانِعَ لِما أعْطَيْتَ . ولا مُعطيَ لِما مَنَعْتَ. وَلا يَنْفَعُ ذا الجَدِّ مِنْكَ الجَدّ}[١٣١].

**واتە: هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە (الله) تاکی بێ هاوبەشە، موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێك دا بەتوانایە. خوایە ڕێگ نی یە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیبەخشی و بەخشەر نی یە بۆ ئەو شتەی تۆ دەیگریتەوەو هیچ خاوەن پایەو دەستەلأتێك دەستەلأتەکەی سوودی نی یە بۆی لە ڕۆژی دوایی دا لە سزای تۆ.**

٣) {لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ لَا حَوْلَ وَلَا قُوَّةَ إِلَّا بِاللَّهِ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَلَا نَعْبُدُ إِلَّا إِيَّاهُ لَهُ النِّعْمَةُ وَلَهُ الْفَضْلُ وَلَهُ الثَّنَاءُ الْحَسَنُ لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ مُخْلِصِينَ لَهُ الدِّينَ وَلَوْ كَرِهَ الْكَافِرُونَ}[١٣٢].

**واتە: هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە (الله) تاك و بێ هاوبەشە. موڵك و ستایش بۆ ئەوەو بەسەر هەموو شتێك دا**

---

[١٣١]) البخاري ١/٢٥٥، ومسلم ١/٤١٤.

[١٣٢]) مسلم ١/٤١٥.

**بەتوانایە. هیچ گۆڕان و هێزێك نیە مەگەر بەخواوە. هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە (الله) وە جگە لەو کەس ناپەرستین. نیعمەت و فەزڵ و ستایشی چاك بۆ ئەوە. هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە (الله). بەدڵسۆزی دینداری بۆ دەکەین ئەگەر چی بێ باوەڕان پێ یان ناخۆش بێ.**

٤) {سُبْحانَ الله، وَالحَمْدُلله، وَاللهُ أَكْبَر (٣٣ جار) لا إِلـهَ إلاَّ الله وَحْدَهُ لا شَريكَ له، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيءٍ قَدير}[١٣٣].

**٥) سوڕەتی ﴿قل هو الله أحد﴾ و ﴿الفلق﴾ و ﴿الناس﴾ بخوێنە لەدوای هەموو نوێژێکی فەرز.[١٣٤]**

---

[١٣٣] )هەر کەسێ ئەمە بڵێت لەدوای هەموو نوێژێکی فەرز ئەوا خوای گەورە لە گوناهەکانی خۆش دەبێ ئەگەر چی بەوێنەی کەفی دەریا بێت) (مسلم ٤١٨/١.

تێبینی: لە فەرموودەی تردا ئەم زیکرانە بە بێ زیادەی (لا الهَ الا الله وَحدَهُ ...) بەم جۆرانە هاتووە :

١- یەکێ (١٠) جار دەیڵێت. البخاری. فتح الباري مجلد(١١) رقم (٦٣٢٩).

٢- یەکی (١١) جار دەیڵێت/ مسلم رقم (٥٩٥ – ١٤٣).

٣- یەکی (٢٥) جار دەیڵێت و لەگەڵ زیادەی (٢٥) جار وتنی : (لا الهَ الا الله)دا، صحيح النسائی (١٢٧٩).

٤- (سبحان الله) (٣٣جار) و (الحمد لله) (٣٣ جار) و (الله اكبر) (٣٤ جار)، کە هەر کەس ئەمە بڵێت نائومێد نابێت. رواه النسائي (صحيح سنن النسائي) رقم (١٢٧٨) و الترمذی (٣٦٥٣) و مسلم (١٣٨٤) انظر سلسلة الصحيحة رقم (١٠٢).

[١٣٤] ابو داود ٨٦/٢ والنسائي ٦٨/٣ وانظر صحيح الترمذي ٨/٢. وە ئەم سێ سوڕەتە پێ یان دەوترێت (المُعَوِّذات) وانظر فتح الباري ٦٢/٩، وهو صحيح (انظر صحيح ابي داود ٢٨٤/١).

**٦) خوێندنی ﴿آية الكرسی﴾ لەدوای هەموو نوێژێكی فەرز.**[١٣٥]

**٧)** {لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ} **(١٠) جار لەدوای نوێژی مەغریب و بەیانی.**[١٣٦]

٨) {اللَّهُمَّ إِنِّي أَسْأَلُكَ عِلْمًا نَافِعًا وَرِزْقًا طَيِّبًا وَعَمَلًا مُتَقَبَّلًا} **لەدوای سلاَو دانەوەی لەنوێژی بەیانی.**[(١٣٧)]

---

[١٣٥] هەر كەسیێ لەدوای هەموو نوێژێكەوە بیخوێنێت هیچ رێگری نیە لە چوونە بەهەشت جگە لەوە نەبێ بمرێ. النسائي في عمل اليوم والليلة برقم (١٠٠). وابن السنى برقم (١٢١) وصححه الالباني في صحيح الجامع ٣٣٩/٥ وسلسلة الاحاديث الصحيحة ٦٩٧/٢ برقم (٩٧٢).

[١٣٦] ئەمە پێش هەستان لە جێگەكەی خۆت و قاچ جولأندن دەوترێ. (هەر كەسێك ئەم نزایە بڵێت لەدوای نوێژی بەیانی و ئێوارەوە ئەو بەهەر دانەیەكی (١٠) چاكەی بۆ دەنووسرێت و (١٠) خراپەی لێ دەسڕێتەوەو، (١٠) پلەش بەرز دەبێتەوەو دەپارێزرێت لە هەموو خراپەیەك و، دەپارێزێت لە شەیتان. وە هیچ گوناهێك نایگرێتەوە. جگە لە شرك، وە چاكترین كەسە كە كردەوەی ئەنجام داوەو تەنها كەسێك لەو باشترە كە لەو باشتری ووتبێت. رواه الترمذي ٥١٥/٥ واحمد ٢٢٧/٤ و انظر صحيح الترغيب و الترهيب رقم (٧٤٥) ص ١٩١-١٩٢ حديث حسن. وانظر تخريجه في زاد المعاد ٣٠٠/١ وانظر صحيح الترمذي ١٩٠/١-١٩١.

وە لە فەرموودەی تردا هاتووە كە : (هەر كەسێك ١٠ جار بیڵێ لەدوای نوێژی بەیانی یەوە ئەوا كۆمەڵێك فریشتەی بۆ دەنێردرێت تا لە شەیتان بیپارێزن تا بەیانی و ١٠ چاكەی ڕزگاركەری بۆ دەنووسرێت و ١٠ گوناهی لەناوبەری دەسڕێتەوەو پاداشتی ڕزگاركردنی ١٠ بەندەی برواداری بۆ دەنووسرێت). انظر ترتيب احاديث (صحيح الجامع الصغير) ٤٣٠/٢ رقم (٣٧).

[١٣٧]) ابن ماجه وغيره، وانظر صحيح ابن ماجه ١٥٢/١ ومجمع الزوائد ١١١/١٠.

واتــە: خوایــە داوای زانســتێکی بــە کــەڵکت لێ دەکــەم (کــە کــردەوەی لەگــەڵ دا بێــت) لەگــەڵ ڕۆزی یــەکی پــاك و حــەڵاڵ و کردەوەیەکی وەرگیراو.

## ئەگەر لە نوێژدا بوویت و بانگیان کردیت

پیاو دەبێت بڵێت: (سبحان الله) وە ئافرەت چەپڵە لێ بدات. (واتە : بە بەری دەستی ڕاستی بکێشێ بە پشتی دەستی چەپی دا، تا بزانن کە نوێژ دەکات).[١٣٨]

## ئەگەر دوو دڵیت بۆ دروست بوو لە نوێژەکەت یان قورئان خوێندنەکەتدا

لە عوثمانی کوڕی عاصەوە (خوا لێ ی ڕازی بێت) فەرمووی : وتم: ئەی پێغەمبەری خوا شەیتان دێتە نێوان من و نوێژەکەم و قورئان خوێندنەکەم و لێم تێك دەدات. پێغەمبەری خوا ﷺ ئەوە شەیتانێکە پێ ی دەگوترێ خەنزەب، یان (خینزەب)، هەر کاتێك

[١٣٨] البخاري ٢/١٣٩-١٤٠ و ٣/٦١و٧٠، ٨٦ ومسلم (٤٢١).

تێبینی: ئەگەر لەنوێژدا بوویت و سڵاویان کرد ئەتوانی بە ئیشارەتی دەستی ڕاستت وەڵام بدەیتەوە بەجۆرێ پشتی دەستت کەمێك بەرەو سەرەوە بەرز بکەیتەوە/ انظر السلسلة الأحاديث الصحيحة (١/٣١٠) رقم الحديث (١٨٥).

هەستت پێکرد پەنا بگرە بە خوا لێ ی (أعـوذُ بـالله مـنَ الشـيطان الرَّجيم)، وە سێ تف بکە بەلای چەپت دا)[١٣٩].

## نوێژە سوننەتەکان

١) پێش نیوەڕۆ چوار ڕکات و لە پاشی یەوە چوار[١٤٠] یان پێشی یەوە دوو.[١٤١]

٢) چوار ڕکات پێش نوێژی عەسر[١٤٢] یان دوو ڕکات.[١٤٣]

٣) دوو ڕکات پاش مەغریب و[١٤٤] دوو ڕکات لە پێشی یەوە.[١٤٥]

٤) دوو ڕکات پاش عیشا[١٤٦] وە دوو ڕکات لە پێشی یەوە.[١٤٧]

---

[١٣٩] وەتیایدا هاتووە کە دەفەرمووێ : ئەمەم کرد خوای گەورە لێ ی دوور خستمەوە / مسلم ١٧٢٩/٤.

[١٤٠] هەر کەسێ پارێزگاریان بکات لەسەر ئاگری دۆزەخ حەرام دەکرێت لەوەی کە تێ ی بچێت، ابو داود ٥٥/٢ و الترمذي ٢٩٢/٢ . وقال : حديث حَسَنٌ غريب. والنسائي ٢٦٥/٣ وابن ماجه ٣٦٧/١ وهو حديث صحيح.

[١٤١] البخاري (رقم ٦٠١ – البغا) ومسلم ٥٧٣/١.

[١٤٢] ڕەحمەتی خوا لەو کەسە بێت لە پێش نوێژی عەسردا چوار ڕکات دەکات، ابو داود ٥٣/٢ والترمذي ٢٩٥/٢ و قال : غريب حَسَن . وهو حديث حَسَن. انظر صحيح الترمذي (٣٥٤).

[١٤٣] البخاري (رقم ٦٠١ – البغا) ومسلم ٥٧٣/١. و بە لای هەندێك لە زانایانەوە دوای نوێژی عەسر دوو ڕکات سوننەت هەیە. انظر مسلم مجلد (١) رقم (٨٣٥).

[١٤٤] پێغەمبەر ﷺ فەرمووی : ئەم دوو ڕکاتە لە ماڵەوەتان بیکەن، ابن ماجه ٣٦٨/١ وهو حديث حَسَن.

[١٤٥] البخاري رقم (٥٩٩– البغا) ومسلم ٥٧٣/١.

[١٤٦] مسلم ٥٠٤/١.

[١٤٧] البخاري (رقم ٦٠١ – البغا) ومسلم ٥٧٣/١.

٥) دوو ڕکات پێش بەیانی.[١٤٨] سوننەتە لە یەکەم ڕکاتدا سوڕەتی (الکافرون) و لە دووەمدا (الاخلاص) بخوێندرێت.[١٤٩]

٦) نوێژی چێشت هەنگاو (الضُّحی) : (٢-٤-٦-٨) ڕکاتە.

باش واتە کە بە دوو بیکەیت و کاتەکەی لە خۆر بەرز بوونەوە بە ئەندازەی ڕمێك و (چاکتر وایە کە ڕۆژ گەرم دەبێت بکرێت) تا کاتی لادانی خۆر لە ناوەڕاستی ئاسمان.[١٥٠]

٧) شەو نوێژ: لایەنە زۆرەکەی (١٣) ڕکاتە بە دوو ڕکاتی سوننەتی فەجرەوە . بە ڕکاتێکی تاك کۆتایی پێ دێت.[١٥١]

٨) نوێژی ویتر : (١-٣-٥) تا (١٣) ڕکاتە.[١٥٢] وە دوو ڕکاتیش لەدواوەی.[١٥٣]

---

[١٤٨] پێغەمبەر ﷺ هیچ نوێژێکی سوننەتی بە ئەندازەی ئەمە پارێزگاری نەدەکردو بەردەوام نەدەبوو لەسەری، البخاري ٤٥/٣ ومسلم ٥٠١/١. وە پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێ : ئەم دوو ڕکاتە چاکترە لەدونیاو چی تێدایە، رواه مسلم. صحیح الترغیب والترهیب (٣٠٩/١).

[١٤٩] مسلم ٥٠٢/١.

تێبینی : سوننەتە دونی ئەنجام دانی نوێژی سوننەتی پێش بەیانی لەسەر لای ڕاست ڕابکێشێت وەك پێغەمبەر ﷺ کردوویەتی / رواه البخاري (٥٢/٣) عن عائشة (رضی الله عنها).

[١٥٠] البخاری ٢٢٦/٤ ومسلم ٤٩٩/١.

[١٥١] مسلم ٥٠٩/١. بەڵام نوێژی تەراویح (١١) ڕکاتە/ اخرجه الشیخان وغیرهما وانظر صحیح ابي داود (١٢١٢).

[١٥٢] ابو داود ١٣٢/٢ والنسائي ٢٣٨/٣ وابن ماجه ٣٧٦/١ وغیرهم وهو حدیث صحیح.

٩) سلاوی مزگەوت (تحیة المَسجد) : دوو ڕكاتە كاتی چوونە مزگەوت پێش دانیشتن ئەنجام دەدرێت.[١٥٤]

١٠) نوێژی داوای چاكە كردن (الإستِخارَة) : دوو ڕكاتە.[١٥٥]

١١) دوو ڕكات لە نێوان هەموو بانگ و قامەتێك دا.[١٥٦]

١٢) نوێژی دەست نوێژ دوای دەست نوێژ شتن دوو ڕكاتە.[١٥٧]

١٣) سوننەتی دوای نوێژی جومعە: چوار ڕكات لە مزگەوت .[١٥٨] یان دوو ڕكات لەماڵەوە.[١٥٩]

---

[١٥٣] ابن خزيمة في (صحيحه) و الدارمي وغيرهما وهو مخرج في الصحيحة. ورواه مسلم من فعله ﷺ، انظر قيام رمضان للألباني ص (٣٣) وانظر (كشف الستر عن ركعتين بعد الوتر) لابن القيم (رحمه الله).

[١٥٤] البخاري ١/٥٣٧ ومسلم ١/٤٩٥ وغيرهما.

[١٥٥] البخاري ٧/١٦٢.

[١٥٦] البخاري (رقم ٦٠١ – البغا) ومسلم ١/٥٧٣.

[١٥٧] هەر كەسێك دەست نوێژی چاك بشوات پاشان دوو ڕكات نوێژ بكات و لەگەڵ خۆیدا مەشغوڵ نەبێت تیایدا خوای گەورە لە گوناهی لەوەو پێشی خۆش دەبێ، البخاري ١/٢٦٦ ومسلم ١/٢٠٤.

[١٥٨] مسلم (٨٨١) وغيره عن ابي هريرة رضي الله عنه.

[١٥٩] مسلم (٨٨٢) عن ابن عمر.

تێبینی : نوێژی سوننەتە ڕەواتیبە مونەكەدەكان (١٢) ڕكاتن. پێغەمبەر ﷺ دەفەرموێت: (هەر كەسێك بەردەوام بێت لەسەر دوانزە ڕكات نوێژی سوننەت لە ڕۆژدا خوای گەورە ماڵێكی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەكات: چوار ڕكات پێش نیوەڕۆو دوو

# هەندێك نوێژی تر

## نوێژی دوو جەژنەکە (ڕەمەزان و قوربان)

ئەو دوو نوێژە واجبە[١٦٠] وە دوو ڕکاتە بەبێ بانگ و قامەت و بەبێ (الصلاة جامِعَة) دەکرێت. لە ڕکاتی یەکەم دا پێش خوێندنی سوڕەتی (الفاتحَة) حەوت تەکبیرات دەکرێ. وە لە ڕکاتی دووەم دا پێنج تەکبیرات دەکرێ، وە زیکرێکی دیاری کراو نەهاتووە کە لە نێوان تەکبیرەکاندا بووترێ.[١٦١] وە لەدوای نوێژ وتارێك دەخوێندرێتەوە. وە سوننەتە خۆ گۆڕین و جلی نوێ لەبەرکردن، خۆبۆن خۆش کردن و دوورکەوتنەوە بۆ نوێژگە (المُصَلَّى) بۆ ئەنجام دانی نوێژەکە مەگەر سەرمای زۆر نەیهێڵێ وە گۆڕینی ڕێگای چوون و گەڕانەوە. وە لە جەژنی ڕەمەزانیشدا سوننەتە پێش دەرچوون بۆ نوێژ چەند دەنکە خورمایەك (یان شتێك)

---

ڕکات لە دوایەوەو دوو ڕکات پاش مەغریب و دوو ڕکات دوای عیشاو دوو ڕکات پێش نوێژی بەیانی) رواه الترمذي والنسائي وابن ماجه عن عائشة (رضى الله عنها) وقد صحح الحديث الألباني في صحيح الجامع الصغير (٢٧٨/٥).

[١٦٠] ئەمە وتەی ابن تەیمیە و ابی حنیفە و غەیری ئەمان وتەیەکی شافعی و یەکێکە لە دوو وتە لە مەزهەبی ئیمامی ئەحمەددا، بڕوانە مجموع الفتاوی ١٦١/٢٣.

[١٦١] بەڵام چەسپاوە لە ابن مەسعوودەوە (ڕەزای خوای لێ بێت) کە سەبارەت بە نوێژی جەژن فەرموویەتی : (بينَ تكبيرَتَينِ حَمْدُ اللهِ عَزَّ وثناء على الله) رَواه البيهقي ٢٩١/٣ بسند جَيد. واتە : لەنێوان دوو تەکبیرەدا سوپاس و ستایشی خوای گەورە دەکرێ.

بخورێت.[١٦٢] وە دروستە (دەف) لێ بدرێت و سروود بوترێ لەلایەن کچۆڵەی باڵغ نەبوو بۆ دەرخستنی شادیو خۆشی تیایدا.[١٦٣]

## نوێژی خۆرو مانگ گیران (الخُسوف والكُسوف)

ئەم نوێژە بە وتنی : (الصَّلاة جامِعة) خەڵکی بۆ کۆدەکرێتەوەو بانگ و قامەتی نی یە، وە سوننەت وایە ئیمام دەنگ بەرز بکاتەوە تیایداو ڕاستترین وەسفی دوو ڕکاتەو لە هەموو ڕکاتێك دا دوو چەمینەوە (الرکوع)ی تێدایە. وە لە نێوان چەمینەوەکاندا سورەتی (الفاتحة) دەخوێندرێتەوە. وە سوننەتە لەو کاتەدا خێرو چاکە زۆر بکرێ وەك پاڕانەوەو تەکبیرات و خێرکردن و داوای لێ خۆشبوون کردن لە خوای گەورە.[١٦٤] بەلام تەپڵ و تەنەکەو دەف لێدان لەوکاتەدا داهێنراو و (بدعة) لە خووڕەوشتی ناموسڵمانانە .

## نوێژە بارانە (صلاةُ الإستسقاء)

سوننەتە لەکاتی باران نەبارین دا بکرێت و ئەم نوێژە لە دەرەوەی شار ئەنجام دەدرێت و دوو ڕکاتەو لەدوایی دا ئیمام

---

[١٦٢] بڕوانە احكام العيدين/علي حسن علي عبدالحميد الحلبي الاثري.

[١٦٣] البخاری (٩٤٩) و (٩٥٣) و (٩٨٧) و (٣٥٣٠) و (٣٩٣١) ورواه مسلم (٨٩٢) وغيرهما عن عائشة (رضي الله عنها).

[١٦٤] بڕوانە الأدلة الرضية... / للشوكاني لاپەڕە ٩١-٩٣.

وتارێك دەخوێنێتەوە. كە تیایدا باسی یادی خواو هەڵنان دەكات بۆ گوێ ڕایەڵی كردنی خوای گەورەو سەرزەنشت كردنی یاخی بوون باس دەكات. وە ئیمام ئەوانەی كە لە گەڵیدان زۆر داوای لێ خۆشبوون لەخوای گەورە دەكەن و دەپاڕێنەوە بۆ لاچوونی ئەم نەبارینی بارانە، لەو دوعایانەش كە دەیكەن، وە ئیمام پۆشاكەكەی هەڵدەگێڕێتەوەو بەهەڵگەڕاوەیی لەبەری دەكات.[١٦٥]

## نوێژی نیازو داوای چاكەكردن لە خوای گەورە (صلاةُ الإستخارَة)

**جابری كوڕی عبدالله (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت : پێغەمبەری خوا ﷺ داوای چاكە كردن (الإستِخارَة)ی فێردەكردین كە لە هەموو كارێكدا ئەنجامی بدەین، هەروەكو چۆن سورەتێكی قورئانی فێر دەكردین و دەیفەرموو : ئەگەر كەسێك لە ئێوە ویستی كارێك بكات. با دوو ڕكات نوێژ بكات جگە لە فەرزەكان، پاشان با بپاڕێتەوەو بڵێ :**

{اللَّهُـمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِـكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُـدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِـنْ فَضْـلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّـكَ تَقْـدِرُ وَلَا أَقْـدِرُ وَتَعْلَـمُ وَلَا أَعْلَـمُ وَأَنْـتَ عَـلَّامُ الْغُيُوبِ اللَّهُـمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ -**ناوی پێویستیەكە دەهێنێ**- خَيْرٌ لِي فِي دِينِي

[١٦٥] بڕوانە (الأدلة الرضية) لاپەڕە (٩٤-٩٥).

تێبینی : وە پێغەمبەر ﷺ دوعای نوێژە بارانەی لەخوای گەورە كرد پشتی دەستەكانی بەرزكردووە بەرەو ئاسمان/ رواه مسلم (٨٩٦) عن انس ﷺ.

وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي —**یان فەرمووی**- عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي —**یان فەرمووی**- فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي}[١٦٦].

**واتە : خوایە من بە زانستی خۆت داوای خێرو چاکەت لێ دەکەم و داوای توانات لێ دەکەم بە توانای خۆت. وە لە فەزڵی گەورەت داوات لێ دەکەم. بەڕاستی تۆ دەتوانی و من ناتوانم و تۆ زانای و من نازانم و تۆ زانای نهێنی و غەیبەکانی. خوایە ئەگەر ئەم مەسەلەیە چاکەو خێری تیایە بۆ دین و ژیان و بژێوی و کۆتایی تەمەنم، یان ئێستا و کۆتایم، ئەوا خوایە بەنسیبم بکەیت و ئاسانی بکەیت لەسەرم و بەرەکەتی تێ بخە بۆم. وە ئەگەر ئەم کارە خراپە بۆ دین و بژێوی و کۆتایی تەمەنم. یان ئێستاو کۆتایم. ئەوا خوایە لێم دوور بخەرەوەو منیش لەو دوور بخەرەوەو خەیرو چاکەم بەنسیب بکە لە هەر شوێنێکەو پاشان دەروونم ڕازی بکە پێی.**

**وە پەشیمان نابێتەوە ئەو کەسەی داوای چاکەو خێر (استخارَة) لە خوای گەورە بکات و ڕاوێژ بە بڕواداران بکات و لەکارەکەی بچەسپێ. خوای گەورە دەفەرموێت :** ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ آل عمران: ١٥٩.

---

[١٦٦]) البخاري ١٦٢/٧.

**وتارێك دەخوێنێتەوە. كە تیایدا باسی یادی خواو هەڵنان دەكات بۆ گوێ ڕایەڵی كردنی خوای گەورەو سەرزەنشت كردنی یاخی بوون باس دەكات. وە ئیمام ئەوانەی كە لە گەڵیدان زۆر داوای لێ خۆشبوون لەخوای گەورە دەكەن و دەپاڕێنەوە بۆ لاچوونی ئەم نەبارینی بارانە، لەو دوعایانەش كە دەیكەن، وە ئیمام پۆشاكەكەی هەڵدەگێڕێتەوەو بەهەڵگەڕاوەیی لەبەری دەكات.[١٦٥]**

## نوێژی نیازو داوای چاكەكردن لە خوای گەورە (صلاةُ الإستخارَة)

**جابری كوڕی عبدالله (ڕەزای خوای لێ بێت) دەفەرمووێت : پێغەمبەری خوا ﷺ داوای چاكە كردن (الإستِخارَة)ی فێردەكردین كە لە هەموو كارێكدا ئەنجامی بدەین، هەروەكو چۆن سورەتێكی قورئانی فێر دەكردین و دەیفەرموو : ئەگەر كەسێك لە ئێوە ویستی كارێك بكات. با دوو ڕكات نوێژ بكات جگە لە فەرزەكان، پاشان با بپاڕێتەوەو بڵێ :**

{اللَّهُـمَّ إِنِّي أَسْتَخِيرُكَ بِعِلْمِكَ وَأَسْتَقْدِرُكَ بِقُدْرَتِكَ وَأَسْأَلُكَ مِنْ فَضْلِكَ الْعَظِيمِ فَإِنَّكَ تَقْدِرُ وَلَا أَقْدِرُ وَتَعْلَمُ وَلَا أَعْلَمُ وَأَنْتَ عَلَّامُ الْغُيُوبِ اللَّهُمَّ إِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ -**ناوی پێویستیەكە دەهێنێ**- خَيْرٌ لِي فِي دِينِي

---

[١٦٥] بڕوانە (الأدلة الرضية) لاپەڕە (٩٤-٩٥).

تێبینی : وە پێغەمبەر ﷺ دوعای نوێژە بارانەی لەخوای گەورە كرد پشتی دەستەكانی بەرزكردووە بەرەو ئاسمان/ رواه مسلم (٨٩٦) عن انس رضي الله عنه.

وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي —**یان فەرمووی**– عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاقْدُرْهُ لِي وَيَسِّرْهُ لِي ثُمَّ بَارِكْ لِي فِيهِ وَإِنْ كُنْتَ تَعْلَمُ أَنَّ هَذَا الْأَمْرَ شَرٌّ لِي فِي دِينِي وَمَعَاشِي وَعَاقِبَةِ أَمْرِي —**یان فەرمووی**– فِي عَاجِلِ أَمْرِي وَآجِلِهِ فَاصْرِفْهُ عَنِّي وَاصْرِفْنِي عَنْهُ وَاقْدُرْ لِي الْخَيْرَ حَيْثُ كَانَ ثُمَّ أَرْضِنِي}[١٦٦].

**واتە : خوایە من بە زانستی خۆت داوای خێرو چاکەت لێ دەکەم و داوای توانات لێ دەکەم بە توانای خۆت. وە لە فەزڵی گەورەت داوات لێ دەکەم. بەڕاستی تۆ دەتوانی و من ناتوانم و تۆ زانای و من نازانم و تۆ زانای نهێنی و غەیبەکانی. خوایە ئەگەر ئەم مەسەلەیە چاکەو خێری تیایە بۆ دین و ژیان و بژێوی و کۆتایی تەمەنم، یان ئێستا و کۆتایم، ئەوا خوایە بەنسیبم بکەیت و ئاسانی بکەیت لەسەرم و بەرەکەتی تێ بخە بۆم. وە ئەگەر ئەم کارە خراپە بۆ دین و بژێوی و کۆتایی تەمەنم. یان ئێستاو کۆتایم. ئەوا خوایە لێم دوور بخەرەوەو منیش لەو دوور بخەرەوەو خەیرو چاکەم بەنسیب بکە لە هەر شوێنێکەو پاشان دەروونم ڕازی بکە پێی.**

**وە پەشیمان نابێتەوە ئەو کەسەی داوای چاکەو خێر (استخارَة) لە خوای گەورە بکات و ڕاوێژ بە بڕواداران بکات و لەکارەکەی بچەسپێ. خوای گەورە دەفەرموێت :** ﴿ وَشَاوِرْهُمْ فِي ٱلْأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى ٱللَّهِ ﴾ آل عمران: ١٥٩.

---

[١٦٦]) **البخاري ١٦٢/٧.**

واتە : مشۆرەت بە موسڵمانان بکە لە مەسەلەداو ئەگەر لەسەر کارەکەت چەسپایت ئەوا پشت بەخوا ببەستە تیایدا.[١٦٧]

## سوننەتەکانی ڕۆژی هەینی (الجُمُعة)

١- زوو هاتن بۆ مزگەوت.[١٦٨]

٢- خۆشتن (کە سوننەتێکی موئەکەدەیەو هەندێ لە زانایان پێ یان وایە واجبە) وە خۆ بۆن خۆش کردن و سەر چەور کردن بە زەیت.[١٦٩]

٣- پۆشینی پۆشاکی نوێ.[١٧٠]

٤- نزیك بوونەوە لە ئیمام.[١٧١]

٥- خوێندنی سورەتی (الکهف).[١٧٢]

---

[١٦٧] مختصر تفسير ابن كثير ٣٣٢/١ بڕوانە الجواب الكافي ابن القيم ص١٢٣.

[١٦٨] البخاري ٣٦٦/٢ ومسلم ٥٨٢/٢.

[١٦٩] البخاري ٣٧٠/٢.

[١٧٠] رواه احمد والشيخان عن ابي سعيد رضي الله عنه انظر فقه السنة. للسيد سابق ٢٩٨/١. وە بڕوانە (السلسلة الصحيحة) (١٢٧٩).

[١٧١] ابو داود ٦٦٣/١ واحمد في المسند ١١/٥ والحاكم في المستدرك ٢٨٩/١ وصحَّحَهُ ووافقه الذهبي.

[١٧٢] هەر کەسێ ڕۆژی هەینی سورەتی (الكهف) بخوێنێ نورێکی بۆ دادەگیرسێ بە ئەندازەی نێوان هەردوو جومعەکە، مستدرك الحاكم ٣٦٨/٢ وقال : هذا حديث صحيح

٦- زۆر صلاوات دان لە پێغەمبەری خوا ﷺ تیایدا.[١٧٣]

## نزاو پاڕانەوەی قەرزاری

١- {اللَّهُمَّ اكْفِنِي بِحَلَالِكَ عَنْ حَرَامِكَ وَأَغْنِنِي بِفَضْلِكَ عَمَّنْ سِوَاكَ}[١٧٤].

**واتە : خوایە بە حەلاڵی خۆت تێرم بکەو بێ نیازم بکە لە حەرامت تا مەجبوری نەبم و بە فەزڵی خۆت دەوڵەمەندو بێ نیازم بکە لە غەیری خۆت.**

٢- {اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ الْهَمِّ وَالْحُزْنِ وَالْعَجْزِ وَالْكَسَلِ وَالْجُبْنِ وَضَلَعِ الدَّيْنِ وَغَلَبَةِ الرِّجَالِ}[١٧٥].

**واتە: خوایە پەنات پێ ئەگرم لەدڵ تەنگی و خەفەت . وە لە بێ دەستەلاتی و تەمبەڵی. وە لە بەخیلی و ترسنۆکی. وە لە**

---

الاسناد ولم يخرجاه. وقال الذهبي : (نعيم – أي : ابن حماد –ذو مناكير) وقال الالباني (صحيح) صغير الجامع الصغير) ٣٤٠/٥ (ح٦٣٤٦).

[١٧٣] رواه أبو داود (١٥٤٧) واسناده صحيح وصححهُ ابن حبان (٥٥٠) والحاكم ٢٧٨/١ ووافقه الذهبي عن أوس بن اوس.

[١٧٤]) هەر كەس ئەمە بڵێ و بە ئەندازەی شاخی (صبیر) قەرزار بێت، خوای گەورە دانەوەی بۆ ئاسان دەكات. الترمذي ٥٦٠/٥ (٣٥٦٣) وحسنهُ الألباني في صحيح الجامع (٢٦٢٥) وانظر صحيح الترمذي ١٨٠/٣.

[١٧٥]) البخاری ١٥٨/٧.

پشــت چــەمانەوە بــەهۆی قورســی قــەرزاری یــەوەو لــەدۆڕانی پیاوانی ئیسلام و شکست هێنانیان.

## ئەگەر کارێکت لەسەر گران بوو

{اللّهُـمَّ لا سَـهْلَ إلاّ مـا جَعَلْتَـهُ سـهْلاً وَأَنْـتَ تَجْعَـلُ الحَـزْنَ إِذا شِـئْتَ سَهلاً}(١٧٦).

واتــە: خوایــە هــیچ کــارێکی ئاســان نــی یــە مەگــەر ئــەوەی تــۆ ئاسـانت کـردووە. وە تـۆ ئەگـەر ویسـتت لێ بـێ زەبـری و ڕەقـی و گرانی زەوی ئاسان دەکەیت.

## ئەو نزایەی کە شەیتان و دوو دڵی یەکانی ڕاودەنێ

١- پەنا گرتن بەخوای گەورە لێ ی.[١٧٧]

٢- بانگ دان.[١٧٨]

[١٧٦]) رواه ابن حبان في صحيحه برقم ٢٤٢٧ (موارد) وابن السني برقم ٣٥١ وقال الحافظ هذا حديث صحيح، وصححه عبد القادر الأرناؤوط في تخريج الأذكار للنووي ص١٠٦.

[١٧٧] ابو داود ٢٠٦/١ والترمذي وانظر صحيح الترمذي ٧٧/١ وانظر سورة المؤمنون آية (٩٨-٩٩).

[١٧٨] مسلم ٢٩١/١ والبخاري ١٥١/١.

٣- زیکرە شەرعی یەکان و خوێندنەوەی قوڕئان.[١٧٩]

## ئەگەر کارێکت ویست و سەری نەگرت و وا دەرنەچوو

١- بڕواداری بەهێز چاکترەو خۆشەویست ترە بەلای خوای گەورەوە لە بڕواداری لاوازو لە هەموو چاکەیەکدا. سوور بە لەسەر ئەو شتەی کەڵکت پێ دەگەیەنێ و پشت بەخوا ببەستەو دەستەوستان لاواز مەبە. وە ئەگەر شتێکت تووش هات مەڵێ ئەگەر ئاواو ئاوام بکردایە ئەوا ئاواو ئاوا دەبوو. بەڵکو بڵێ : (قَدَرُ اللهِ وَما شاءَ فَعَلَ) واتە : بڕیاری خوای گەورەو ئەو شتەی ویستی بوو کردی و ئەنجامی دا. چونکە ووشەی (ئەگەر) دەرگای کاری شەیتان دەکاتەوە)[١٨٠]

---

[١٧٩] ماڵەکانتان مەکەن بە گۆڕستان. بەڕاستی شەیتان لەو ماڵە ڕادەکات کە سوڕەتی (البَقَرة)ی تێدا دەخوێندرێ. مسلم ٥٣٩/١. وە لەو نزایانەی کە شەیتان ڕاودەنێ : زیکری بەیانیان و ئێواران و خەوتن و هەستان لە خەو و زیکری چوونە ماڵ و هاتنە دەرەوە لێ ی و زیکری چوونە مزگەوت و هاتنە دەرەوە لێ ی و غەیری ئەمانە لە زیکرە شەرعی یەکان وەکو خوێندنی (آیة الکرسی) لە پێش خەوتنداو خوێندنی دوو ئایەتی کۆتایی سوڕەتی (البقرة). وە هەر کەسێك (سەد) جار بڵێ : (لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ) ئەوا دەبێتە قەڵغان بۆی لە شەیتان بەدرێژایی ئەو ڕۆژە. هەروەها بانگ دان شەیتان ڕاودەنێ.

[١٨٠] مسلم ٢٠٥٢/٤.

# لەکاتی پژمین (العَطَس)دا

١- دەست یان کراسەکەت بخەرە سەر دەمت و دەنگت نزم بکەرەوە.[١٨١]

٢- ئەگەر یەکێك لە ئێوە پژمی با بڵێ : (الحمْدُ لله)[١٨٢] یان (الحمْدُ لله على كُلِّ حال).[١٨٣]

واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوای گەورە لەسەر هەموو حاڵێك وە با براکەی یان هاوەڵەکەی پێ ی بڵێ : (يَرْحَمُكَ الله) واتە: خوا ڕەحمت پێ بکات، وە وەئەگەر وتی : (يَرحَمُكَ الله) ئەم پێ ی بڵێ : (يهديكمْ الله ويُصلحُ بالكم).[١٨٤]

واتە: خوا ڕێنمایتان بکات و حاڵتان بۆ چاك بکات.

٣- ئەگەر کەسێك لە ئێوە پژمی و سوپاسی خوای کردو بیستتان (هەمووتان) وەڵامی بدەنەوە بە : (يَرْحَمُك الله) بەڵام ئەگەر سوپاسی خوای نەکرد وەڵامی مەدەنەوە)[١٨٥].

---

[١٨١] ابو داود (٥٠٢٩) والترمذي (٢٧٤٦) وقال : حديث حسن صحيح، وسنده حَسن عن ابي هريرة ﷺ.

[١٨٢] البخاري ١٢٥/٧.

[١٨٣] صحيح (صحيح سنن ابي داود ٩٤٩/٣).

[١٨٤] البخاري ١٢٥/٧.

[١٨٥] مسلم ٢٢٩٢/٤.

تێبینی : هەتا سێ جار وەڵامی کەسێك بدەرەوە کە پژمی بە (یَرحَمُكَ). ئەگەر زیاد لە سێ جار پژمی وەڵامی مەدەرەوە چونکە دیارە نەخۆشەو هەڵامەتی یەتی.[١٨٦]

ئەگەر بێ باوەڕێك پژمی و (الحَمْدُ لله)ی کرد پێ ی بڵێ:
(یَهدیکُمُ اللهُ وَیُصلِحُ بالَکم).[١٨٧]

## لەکاتی باوێشك دان (التثاؤب)دا

١- (باوێشك لە شەیتانەوەیە. ئەگەر باوێشکت هات تا دەتوانی بیگێڕەوە چونکە شەیتان لەوکاتەدا پێت پێ دەکەنێت).[١٨٨]

٢- ئەگەر باوێشکت دا دەست بخەرە سەر دەمت چونکە شەیتان دەچێتە ناوی.[١٨٩]

[١٨٦] بۆ درێژەی ئەمە بە بەڵگە صەحیحەکانیەوە بڕوانە (الأذکار) لاپەڕە (٢٦٧-٢٦٨).
[١٨٧] الترمذي ٨٢/٥ و احمد ٤٠٠/٤ و ابو داود ٣٠٨/٤ وانظر صحیح الترمذي ٣٥٤/٢.
[١٨٨] البخاري ٥٠١/١٠ عن ابي هریرة رضي الله عنه.
[١٨٩] رواه مسلم (٢٩٩٥) عن ابي سعید الخدري رضي الله عنه.

## نزاو پاڕانەوە بۆ موسڵمانێك ئەگەر هاوسەری هێنا (دوای مارە بڕین)

١- پێ ی بڵێ: {بارَكَ اللهُ لَكَ وبارَكَ عَلَيْكَ، وجَمَعَ بَيْنَكُما في خَيرٍ}[١٩٠].

واتە : خوا لێت پیرۆز بکات و بەرەکەت بڕژێ بەسەرت داو لەسەر خێر کۆتان بکاتەوە.

## نزاو پاڕانەوەی پێش چوونە لای خێزان و (جیماع کردن)

{بِسْمِ اللَّهِ اللَّهُمَّ جَنِّبْنَا الشَّيْطَانَ وَجَنِّبْ الشَّيْطَانَ مَا رَزَقْتَنَا}[١٩١].

واتە : بەناوی خوا، خوایە شەیتانمان لێ دوور بخەرەوەو شەیتان لەو منداڵەش دوور بخەرەوە کە پێمان دەبەخشی.

---

١٩٠) اخرجه اصحاب السنن إلا النسائي وانظر صحيح الترمذي ٣١٦/١..

١٩١) ئەگەر ئەمە بڵێ ی منداڵیان بوو، ئەوا شەیتان هەرگیز ناتوانێ زیانی پێ بگەیەنێ. البخاري ١٤١/٦ ومسلم ١٠٢٨/٢.

## ئەو نزاو پارانەوەی کە منداڵی پێ پەنا دەدرێ

ابن عباس (ڕەزای خوای لێ بێت) فەرموویەتی: پێغەمبەری خوا ﷺ حەسەن و حوسەینی پەنا دەدا بەمە : { أُعِيذُكُمَا بِكَلِمَاتِ اللَّهِ التَّامَّةِ مِنْ كُلِّ شَيْطَانٍ وَهَامَّةٍ وَمِنْ كُلِّ عَيْنٍ لَامَّةٍ }(١٩٢).

واتە: پەناتان دەدەم بە وشە تەواوەکانی خوای گەورە، لە هەموو شەیتان و گیانلەبەرو زیندەوەرێکی زیانبەخشی خاوەن ژەهر. وە لەهەموو چاوێکی لۆمەکراو و پیس. (یان –مِنْ كُلِّ عَيْنٍ لامّة– واتە : لە هەموو دەردو نەخۆشی یەك کە مرۆڤ دەیگرێ لە شێتی و کەم عەقڵی.[١٩٣]

وە دەیفەرموو: ئەمە ئیبراهیم پێغەمبەر (علیه السلام) ئیسماعیل و ئیسحاقی کوڕی پێ پەنا دەدا.[١٩٤]

---

[١٩٢]) البخاري ٤/١١٩.

[١٩٣] الفتح ٦/٢٧٣.

[١٩٤] البخاري (٣٣٧١).

## ذکرو دوعای ئافرەت کاتێك منداڵی دەبێت

١- هۆزەبانە (العقیقە)ی بۆ بکە. ئەویش سەربڕینی دوو مەڕە بۆ نێرو، یەك مەڕ بۆ منداڵی مێ یینە.[١٩٥]

٢- ئەمە لە ڕۆژی حەوتەم دا دەکرێت و منداڵەکە ناو دەنرێت بە ناوێکی جوانی شەرعی.[١٩٦] ئەگەر نەکرا ئەتوانرێ لە (١٤) یان (٢١) دا بکرێ.[١٩٧]

٣- وە (لە ڕۆژی یەکەم)دا گۆش (تَحنیك) دەکرێت، ئەویش بە خورمایەك لەدەمی خۆت دا شلی بکەرەوەو بیدە لە مەلآشووی و دوعای خێری بۆ بکە.[١٩٨]

٤- وە (لە ڕۆژی حەوتەم)دا سەری دەتاشرێ و بە ئەندازەی کێشەکەی زیو دەبەخشیتەوە بەسەر هەژاران دا.[١٩٩]

---

[١٩٥] اخرجه الترمذي ٩٦/٤ رقم (١٥١٣) وقال : حديث حسن صحيح، وهو حديث صحيح.

[١٩٦] اخرجه ابو داود ٢٦٠/٣ رقم (٢٨٣٨) والترمذي ١٠١/٤ رقم (١٥٢٢) والنسائي ١٦٦/٧ رقم (٤٢٢٠) وابن ماجه وغيرهم . وهو حديث صحيح. وانظر ابن ماجه (٣١٦٥).

[١٩٧] موقوف على عائشة . انظر (صحيح الجامع الصغير).

[١٩٨] صحيح (صحيح سنن ابي داود ٩٦١/٣). هەروەها ئەبی موسا دەفەرموێت : (منداڵێکمان بوو بردم بۆ لای پێغەمبەر ﷺ و ئەویش ناوی نا ئیبراهیم و خورمایەکی لەدەمی خۆی دا شل کردەوەو دەمی منداڵەکەی پێ شیرین کردو پاڕایەوە بۆی بە بەرەکەت و دایەوە پێم ...) رواه البخاری (٦١٩٨) ومسلم من حديث ابي موسى الأشعری / انظر تحفة الذاكرين ص ١٨٢.

[١٩٩] اخرجه احمد في المسند ٢٩٠/٦ والبيهقي في (السنن الكبرى) ٣٠٤/٩ . وهو حديث حَسَن.

## فەزڵی سەردانی کردنی نەخۆش

**پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموویێت :** {إِذَا عَادَ الرَّجُلُ أَخَاهُ الْمُسْلِمَ مَشَى فِي خِرَافَةِ الْجَنَّةِ حَتَّى يَجْلِسَ فَإِذَا جَلَسَ غَمَرَتْهُ الرَّحْمَةُ فَإِنْ كَانَ غُدْوَةً صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُمْسِيَ وَإِنْ كَانَ مَسَاءً صَلَّى عَلَيْهِ سَبْعُونَ أَلْفَ مَلَكٍ حَتَّى يُصْبِحَ}[٢٠٠].

**واتـە : ئەگـەر پیاوێـك سـەردانی بـرا موسـڵمانەکەی بکـات و نەخۆشـی یەکـەی بەسـەر بکاتـەوە ئـەوا بـەناو باخێکی میـوەی بەهەشت دا دەڕوات هـەتا دادەنیشـێ. وەکـاتێ دانیشـت بـەزەیی خوایی دای دەپۆشێت و دای دەگرێتەوە. وە ئەگـەر بـەیانی بێـت حـەفتا هـەزار مەلائیکـەت بـۆی دەپاڕێنـەوە هـەتا ئێـوارەی لێ دەبێتـەوە. وە ئەگـەر ئێـوارە بێـت حـەفتا هـەزار مەلائیکـەت بـۆی دەپاڕێنەوە هەتا بەیانی لێ دەبێتەوە.**

[٢٠٠]) رواه الترمذي وابن ماجه واحمد وانظر صحيح ابن ماجه ٢٤٤/١ وصحيح الترمذي ٢٨٦/١ وصححه ايضا احمد شاكر.

## نزاو پاڕانەوە بۆ نەخۆش لەكاتى سەردانى كردنى دا

١- پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر بچوایە بۆ سەردانی نەخۆشێك پێ ی دەفەرموو : { لا بأسَ طَهُورٌ إن شاءالله }[٢٠١]. واتە هیچ نی یە پاك دەبێتەوە لە گوناه بە ویستی خوای گەورە.

٢- هیچ بەندەیەكی موسڵمان نی یە كە سەردانی نەخۆشێك بكات كە ئەجەلی نەهاتبێ و حەوت جار بڵێ : { أَسْأَلُ اللهَ العَظِيمَ رَبَّ العَرْشِ العَظِيمِ أن يَشْفِيَكَ } ئیلا چاك دەبێتەوە.[٢٠٢]

٣- { بِسْمِ الله ارقيكَ . مِنْ كُلِّ شَيءٍ يُؤذيكَ. وَمِنْ شَرِّ كُلِّ نَفْسٍ او عَينٍ حاسِدٍ اللهُ يشفيكَ . بِسْمِ الله اُرقيكَ }[٢٠٣]

واتە : بەناوی خواوە دوعات بۆ دەكەم لە هەموو شتێك كە ئەزیەتت دەدات و لە خراپەی هەموو نەفسێك یان چاوی حەسوود بەرێك كە حەسوودیت پێ دەبات خوا شیفات بدات، بەناوی خواوە دوعات بۆ دەكەم.

---

[٢٠١]) البخاري مع الفتح ١١٨/١٠.

[٢٠٢]) اخرجه الترمذي وابو داود وانظر صحيح الترمذي ٢١٠/٢ وصحيح الجامع ١٨٠/٥.

[٢٠٣] مسلم (١٧١٨/٤) عن ابي سعيد رضي الله عنه.

## نزاو پارانەوەی نەخۆش بۆ خۆی

دەستت بخەرە سەر ئەو شوێنەی ئازاری هەیە لە لەشت داو سێ جار بڵێ : (بِسمِ الله) وە حەوت جار بڵێ : {أعوذُ بِالله وَقُدرَتِه مِنْ شَرِّ ما أجِدُ وأحاذِرُ}[٢٠٤]

واتە: پەنا ئەگرم بەخوای گەورەو قودرەت و توانای لەخراپەی ئەو ئازارەی هەستی پێ ئەکەم‌و سڵی لێ دەکەمەوە.

## ئەگەر تووشی موسیبەتێك بوو (کەسێکی مرد)

خوای گەورە دەفەرمووێت :

﴿ ... وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ أُوْلَٰٓئِكَ عَلَيۡهِمۡ صَلَوَٰتٞ مِّن رَّبِّهِمۡ وَرَحۡمَةٞۖ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلۡمُهۡتَدُونَ ﴿١٥٧﴾ ﴾ البقرة: ١٥٥ ــ ١٥٧.

واتە: ... وە مژدە بدە بە ئامگران ئەوانەی کاتێ تووشی موسیبەتێك دەبن دەڵێن ئێمە موڵکی خواین و هەر بۆ لای ئەو

---

[٢٠٤] مسلم ١٧٢٨/٤.

**دەگەڕێینەوە، ئەوانە ستایش و سەنا و ڕەحمەت و ئەمینیان بۆ هەیە لە سزا لەلایەن خوای پەروەردگاریانەوەو ئەوانەش بە ڕاستی هیدایەت دراوانن.**[205]

١- {إنّا لله وَإنّا إلَيْهِ راجِعُون اللّهُمَّ أَجِرْنِي فِي مُصيبَتي وَأَخْلِف لِي خَيْراً مِنْها}[206].

**واتە: ئێمە موڵکی خواین و بۆ لای ئەو دەگەڕێینەوە. خوایە پاداشتم بدەیتەوە لەم موسیبەتەداو کەسێکی باشترم بۆ بخەرەوە جێگەی.**

٢- **یان بڵێ** : { اللّٰهُمَّ اغْفِرْ لِي وَلَهُ. وأعقِبني مِنهُ عُقبَةً حَسَنَةً}[207].

**واتە: خوایە لە من و لە ئەویش (مردووەکە) خۆش ببەو کەسێکی چاکم بۆ بخەرەوە شوێنی.**

---

[205] تفسیر القرآن العظیم ١/١٨٤.

[206]) هیچ موسڵمانێك نی یە کە موسیبەتێکی ئاوای تووش ببێ و وەك ئەوەی خوای گەورە فەرمانی پێ کردووە بڵێ (إنا لله ....) (فەرموودەکە ....) ئیلا خوای گەورە کەسێکی چاکتری لە پاش ئەو بۆ دەخاتە شوێنی، مسلم ٢/٦٣٢.

[207] مسلم ٢/٢٢٢.

## ئاوات نەخواستنی مردن

**هیچ کەسێك لە ئێوە ئاواتی مردن نەخوازێ (بەهۆی ناڕەحەتی یەکەوە کە تووشی هاتووە)[٢٠٨]، ئەگەر هەردەبوو بیڵێ با بڵێ: {اللهُمَّ احيِيني ما كانَت الحَياةُ خَيراً لِي. وَتَوَفَّني إذا كانَتِ لوَفاةُ خيراً لِي}[٢٠٩]**

**واتە: خوایە بمژێینە هەتا ئەو کاتەی ژیان چاکە بۆم و بمرێنە ئەگەر مردن خێر بوو بۆم.**

---

[٢٠٨] دروست نیە موسڵمان ئاواتی مردن بخوازێ. لەبەر ئەوەی چاکترین کەس ئەو کەسەیە کە تەمەنی درێژ بێت و کرداری چاکی زۆر بێت. وە تا گوناه کەم بکاتەوەو پەشیمان ببێتەوە لێ ی. هەروەها لەبەر سەختی و ناڕەحەتی مردن و ژیانی ناو گۆڕ. بەڵام ئەگەر موسڵمان لە دین و ئیمانی ترسی هەبوو کە زیانی پێ بگات لەکاتی زۆربوونی فیتنەو ئاشووبەدا، ئەوا ئەو کاتە دروستە ئاواتی مردن بخوازێت تا ژینی کۆتایی پێ بێت بەڵام دینی سەلامەت بێت.

[٢٠٩] البخاري ١٠/١٠٧،١٠٨، ومسلم (٢٦٨٠)

## پاڕانەوە بۆ مردوو لە نوێژی مردوودا

{اللَّهُمَّ اغْفِرْ لَهُ وَارْحَمْهُ وَعَافِهِ وَاعْفُ عَنْهُ وَأَكْرِمْ نُزُلَهُ وَوَسِّعْ مُدْخَلَهُ وَاغْسِلْهُ بِالْمَاءِ وَالثَّلْجِ وَالْبَرَدِ وَنَقِّهِ مِنْ الْخَطَايَا كَمَا نَقَّيْتَ الثَّوْبَ الْأَبْيَضَ مِنْ الدَّنَسِ وَأَبْدِلْهُ دَارًا خَيْرًا مِنْ دَارِهِ وَأَهْلًا خَيْرًا مِنْ أَهْلِهِ وَزَوْجًا خَيْرًا مِنْ زَوْجِهِ وَأَدْخِلْهُ الْجَنَّةَ وَأَعِذْهُ مِنْ عَذَابِ الْقَبْرِ (مِنْ عَذَابِ النَّارِ)}[٢١٠].

**واتە: خوایە لێ ی خۆش ببەو ڕەحمی پێ بکەو بی پارێزەو لێ ی ببورەو لەشوێنگەیەکی خۆش و بەڕێزدا داینێ و شوێنەکەی بۆ فراوان بکەو بە ئاوی باران و بەفرو تەرزە بیشۆرەو لە گوناه پاکی بکەرەوە هەر وەك چۆن پۆشاکی سپی پاك دەبێتەوە لە چڵك. وەماڵەکەی بۆ بگۆڕە بە خانەیەکی خۆش ترو کەس و کارێکی بدەرێ لە کەس و کارەکەی چاکترو خێزانێکی بدەرێ لە خێزانەکەی باشترو بیخەرە بەهەشتەوەو پەنای بدە لە سزای گۆڕو سزای ئاگری دۆزەخ.**

---

[٢١٠]) مسلم ٢/ ٦٦٣.

## پاڕانەوە دوای ناشتنی مردوو

{ اللَّهُمَّ اغفِرْ لَهُ، اللَّهُمَّ ثَبِّتْهُ }[٢١١]

**واتە: خوایە لێ ی خۆش بە، خوایە چەسپاو و دامەزراوی بکە.**

## لەکاتی سەردانی گۆڕستان دا

{السَّلَامُ عَلَى أَهْلِ الدِّيَارِ مِنْ الْمُؤْمِنِينَ وَالْمُسْلِمِين ويَرْحَمُ اللّهُ الْمُسْتَقْدِمِين مِنَّا وَالْمُسْتَأْخِرِينَ وَإِنَّا إِنْ شَاءَ اللَّهُ بِكُمْ لَلاحِقُون، أسْأَلُ اللهَ لَنا ولَكُم العَافية }[٢١٢].

**واتە : سڵاوتان لێ بێت خاوەنی خانەکان لە ئیمانداران و موسڵمانان ئێمەش بە ویستی خوای گەورە دەگەین پێتان. خوا بەزەیی بە پێشکەوتووەکانمان و دواکەوتەکانماندا بێتەوە. لە خوای گەورە دەپاڕێمەوە ئێمەو ئێوەش بپارێزێ.**

---

[٢١١] **پێغەمبەر ﷺ کە تەواو دەبوو لە ناشتنی مردوو لەسەری ڕادەوەستاو دەیفەرموو : (داوای لێ خۆشبوون و دامەزراوی بکەن بۆ براکەتان. چونکە بەڕاستی ئێستا پرسیاری لێ دەکرێت) ابو داود ٣/٣١٥ والحاكم وصحّحه ووافقه الذهبي ١/٣٧٠.**

[٢١٢] **) مسلم ٢/٦٧١، وابن ماجه واللفظ له ١/٤٩٤ عن بريدة رضي الله عنه، وما بين المعكوفين من حديث عائشة رضي الله عنها عند مسلم ٢/٦٧١.**

تێبینی: داوای لێ خۆشبوون کردن بۆ کەسێك لەسەر بێ باوەڕێتی مردبێت دروست نیە، وە پێغەمبەری خوا ﷺ فەرمانی کردووە کە هەر کاتێك بەلای گۆڕی بێ بڕوایەکدا ڕەت بوویت مژدەی دۆزەخی پێ بدەین (بەو مەرجەی دڵنیا بین لەوەی بە بێ بڕوایی مردووە).

## نزاو پاڕانەوەی شەوی قەدر (لَيلَةُ القَدر)

{ اللّهُمّ إنّكَ عفُوٌ (كَريمٌ) تُحِبُّ العَفوَ فاعفُ عَنّي }[213]

## جەژنە پیرۆزە کردن

{تَقبّلَ الله منّا ومِنكَ}[214]

واتە: خوا لە ئێمەو لە تۆشی قبوڵ بکات.

[213] صحيح (صحيح ابن ماجه ٣٢٨/٢) بدون لفظ: (كريم) والترمذي (صحيح الترمذي) (٢٧٨٩) بهذا اللفظ وصحّحَهُ الألباني.

[214] قال احمد: اسناد حديث ابي امامة جيد. وانظر (الجوهر النقي) ٣٢٠/٣ وقال السيوطي في (الحاوي) ٨١/١: إسناده حسن. وقال ابن حجر: ورويناه في (المحامليات) بإسناد حسن عن جبير ابن نفير من فعل الصحابة ايضاً / (فتح الباري) ٤٤٦/٢.

## لەکاتی تورەبووندا

بلێ : {أعوذُ باللهِ مِنَ الشَّيطانِ الرّجيم}[٢١٥]

واتە : پەنا دەگرم بە خوای گەورە لە شەیتانی نەفرەت لێ کراو و دوورخراوە لە ڕەحمەتی خوا.

## ئەگەر کەسێکی تووش بوو بە بەلایەکت بینی

بلێ : {الْحَمْدُ لِلَّهِ الَّذِي عَافَانِي مِمَّا ابْتَلَاكَ بِهِ وَفَضَّلَنِي عَلَى كَثِيرٍ مِمَّنْ خَلَقَ تَفْضِيلًا}[٢١٦].

واتە: ستایش بۆ ئەو خوایەی منی پاراست لەوەی تووشی تۆی کردووەو فەزلی منی داوە بەسەر زۆرێک لە دروست کراوەکانی دا.

---

[٢١٥] البخاري ٩٩/٧ ومسلم ٢٠١٥/٤.

[٢١٦]) هەر کەسێ ئەمە بلێ لەو بەلایەی تووش نابێ. الترمذي ٤٩٣/٥ و ٤٩٤/٥ وانظر صحيح الترمذي ١٥٣/٣.

## کەفارەتی دانیشتگا (مەجلیس)

{سُبْحَانَكَ اللَّهُمَّ وَبِحَمْدِكَ أَشْهَدُ أَنْ لَا إِلَهَ إِلَّا أَنْتَ أَسْتَغْفِرُكَ وَأَتُوبُ إِلَيْكَ}(٢١٧).

**واتە: خوایە پاك و بێ گەردی و ستایش بۆ تۆیە. شایەتی دەدەم کە هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە تۆ، داوای لێ خۆشبوونت لێ دەکەم و دەگەڕێمەوە بۆ لات.**

## ئەگەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کردیت

**هەر کەسێك چاکەیەکی لەگەڵدا کراو بە بکەری چاکەکەی ووت : (جزاك اللهُ خيراً) واتە: خوا پاداشتی چاکەت بداتەوە. ئەوا ئەوپەڕی سوپاس و ستایشی کردووە.** [٢١٨]

---

[٢١٧]) اخرجه اصحاب السنن وانظر صحيح الترمذي ١٥٣/٣، وقد ثبت ان عائشة رضي الله عنها قالت: ما جلس رسول الله صلى الله عليه وسلم مجلسا، ولا تلى قرآنا، ولا صلى صلاة إلا ختم ذلك بكلمات... «الحديث، اخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة برقم ٣٠٨، واحمد ٧٧/٦ وصححه الدكتور فاروق حمادة في تحقيقه لعمل اليوم والليلة للنسائي ص٢٧٣.

[٢١٨] اخرجه الترمذي رقم (٢٠٣٥) وانظر صحيح الجامع (٦٢٤٤) وصحيح الترمذي ٢٠٠/٢.

## ئەوذیکرەی کە خوا دەتپارێزێ بەهۆیەوە لە (دەجال)

(مَــنْ حَفِـظَ عَشْــرَ آيــاتٍ مِــنْ أوَّلِ ســورةِ الكَهْـفِ عُصِــمَ مِــن الدَّجَالِ)[٢١٩]

**واتە: هەر کەسێك (١٠) ئایەتی سەرەتای سورەتی (الکهف) لەبەر بکات لە دەجال دەپارێزێت.**

**وە پەنا گرتن بە خوای گەورە لە ئاشووبەی دەجال لەدوای تەحییاتی کۆتایی هەموو نوێژێکەوە.**

## ئەگەر کەسێکت لەبەر خوا خۆش ویست

پێ ی بڵێ : {إنّي أُحِبُّكَ فِي اللهِ}[٢٢٠]

**واتە: من لەبەر خوای گەورە تۆم خۆش دەوێت.**

---

[٢١٩] مسلم ٥٥٥/١. وە لە ڕیوایەتێکدا : (مِن آخر الكَهف). واتە: لەکۆتایی سورەتی (الكهف) ٥٥٦/١.

[٢٢٠] اخرجه ابو داود ٣٣٣/٤ وحسَّنَه الألباني في صحيح ابي داود ٩٦٥/٣.

## ئەگەر موسڵمانێك پێ ی ووتی من لەبەر خوا خۆشم دەوێیت

پێ ی بڵێ: {أَحَبَّكَ الَّذي احبَبْتَني لَهُ}.[٢٢١]

واتە: ئەو خوایە خۆشی بووێیت کە منت لەبەر ئەو خۆش دەوێ.

## ئەگەر موسڵمانێك پێ کەنی

پێ ی بڵێ : {أضحَكَ اللهُ سِنَّكَ}[٢٢٢]

واتە: یاخوا هەردەم لە پێکەنین و دڵ خۆشی دا بیت.

## ئەگەر کەسێك پارەو سامانی خستە ڕووت

پێ ی بڵێ : {بارَكَ اللهُ لَك في أهلكَ وَمالكَ}[٢٢٣]

واتە: خوای گەورە فەڕو بەرەکەت بخاتە خێزان و ماڵ و سامانتەوە.

---

[٢٢١] اخرجه ابو داود ٤/٣٣٣ وحسَّنَه الألباني في صحيح ابي داود ٣/٩٦٥.

[٢٢٢] رواه البخاري الفتح (٣٦٨٣) ومسلم في فضائل الصحابة (٢٣٩٦) عن سعد بن ابي وقاص ﷺ.

[٢٢٣] البخاري مع الفتح ٤/٨٨.

## نزاو پاڕانەوە بۆ خاوەن ماڵ لە کاتی قەرز گەڕاندنەوەدا

{بـارَكَ اللهُ لَـكَ في أهلِـكَ ومالـكَ. إنَّمـا جَـزاءُ السَّـلفِ الحمْـدُ والأداءُ} [٢٢٤]

واتە: خوا بەرەکەت بخاتە ناو خێزان و سامانتەوە. بەڕاستی پاداشتی قەرزدان سوپاس و ستایش کردن و قەرز گەڕاندنەوەیە وەك خۆی.

## نزاو پاڕانەوەی ترسان لە هاوبەش دانان بۆ خوا (الشِّرك)

{اللَّهُـمَّ إِنِّي أَعـوذُ بِـكَ أَن أُشْـرِكَ بِـكَ وأَنـا أَعْلَـمُ، وأَسْـتَغْفِرُكَ لِمـا لا أَعْلَم} [٢٢٥].

واتە: خوایە پەنات پێ ئەگرم لەوەی کە هاوبەشت بۆ دابنێم و ئاگادار بم پێ ی، وە داوای لێخۆشبوونت لێ دەکەم لەوەی کە نایزانم و ئاگادار نیم پێ ی.

---

[٢٢٤] اخرجه النسائي في عمل اليوم والليلة ص (٣٠٠) وابن ماجه ٨٠٩/٢ وانظر صحيح ابن ماجه ٥٥/٢ وفي روايته : (... إنَّما جزاءُ السَّلَفِ الوَفاءُ وَالحَمْدُ) حديث حَسَن. واتە: ... پاداشتی قەرز گەڕاندەوە وەفاو سوپاس کردنە لەسەری.

[٢٢٥]) احمد ٤٠٣/٤ وغيره وانظر صحيح الجامع ٢٣٣/٣ وصحيح الترغيب والترهيب للألباني ١٩/١.

## کەفارەتی سوێند خواردن بە غەیری خوا

هەر کەسێ سوێندی خواردو وتی بەلات و عوزا[٢٢٦] با بڵێ : (لا الـه الا الله). وە هـەر کەسـێك بـە هاوڕێکـەی ووت : وەرە بـا قومارت لەگەڵ بکەم با خێرێك بکات.[٢٢٧]

## پاڕانەوەی سواربوونی وولاّغ یان ئامێری گواستنەوە

{بسم الله، الحمد لله {سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ } { وإنا إلى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ} الحمد لله، الحمد لله، الحمد لله، الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، سبحانك اللهم إني ظلمت نفسي فاغفر لي، فإنه لا يغفر الذنوب إلا أنت}[٢٢٨].

واتە: بەناوی خوا. ستایش بۆ خوا. پاکی و بێ کەم و کورتی و گەورەیی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ژێربار خستووین و ئێمـە دەستەڵاتمان نەبوو بەسەری دا. وە ئێمە (لەڕۆژی دوای یدا) بۆ

---

[٢٢٦] کە ئەم دووانە، ناوی دوو بت و پەرستراوی سەردەمی نەفامی بووە، وە بێ گومان سوێند خواردن بە هەر شتێکی تر (جگە لە خوای پەروەردگار) هەمان حوکمی هەیەو دروست نی یەو هەمان کەفارەتی دەوێ.

[٢٢٧] البخاري ٤٦٧/١١ ومسلم (١٦٤٧) عن ابي هريرة رضي الله عنه.

[٢٢٨]) ابو داود ٣٤/٣ والترمذي ٥٠١/٥ وانظر صحيح الترمذي ١٥٦/٣.

**لای پەروەردگارمان دەگەڕێینەوە. سوپاس و ستایش بۆ خوا ... خوا گەورەیە... پاکی و کوم و کورتی و گەورەیی بۆ تۆیە خوایە من ستەمم لە نەفسی خۆم کردووەو لێم خۆش بە . بەڕاستی کەس لە گوناه خۆش نابێ جگە لەتۆ.**

## نزاو پاڕانەوە چوون بۆ گەشت

{الله أكبر، الله أكبر، الله أكبر، (سُبْحَانَ الَّذِي سَخَّرَ لَنَا هَذَا وَمَا كُنَّا لَهُ مُقْرِنِينَ، وَإِنَّا إِلَى رَبِّنَا لَمُنْقَلِبُونَ) اللَّهُمَّ إِنَّا نَسْأَلُكَ فِي سَفَرِنَا هَذَا الْبِرَّ وَالتَّقْوَى وَمِنْ الْعَمَلِ مَا تَرْضَى اللَّهُمَّ هَوِّنْ عَلَيْنَا سَفَرَنَا هَذَا وَاطْوِ عَنَّا بُعْدَهُ اللَّهُمَّ أَنْتَ الصَّاحِبُ فِي السَّفَرِ وَالْخَلِيفَةُ فِي الْأَهْلِ اللَّهُمَّ إِنِّي أَعُوذُ بِكَ مِنْ وَعْثَاءِ السَّفَرِ وَكَآبَةِ الْمَنْظَرِ وَسُوءِ الْمُنْقَلَبِ فِي الْمَالِ وَالْأَهْلِ} **وە ئەگەر گەڕایەوە لە سەفەر دەیڵێتەوەو ئەمەی بۆ زیاد دەکات :** {آيبون، تائِبُون، عابِدُون، لِرَبِّنا حَامِدون}[٢٢٩].

**واتە: خوا گەورەیە... پاکی و بێ گەردی بۆ ئەو خوایەی ئەمەی بۆ ژێر با خستووین و ئێمە دەستەڵاتمان نەبوو بەسەری دا، وە ئێمە (لەڕۆژی دوایی دا) بۆلای پەروەردگارمان**

[٢٢٩]) مسلم ٢/٩٩٨.

دەگەڕێینەوە. خوایە لەم گەشتەماندا داوای کردەوەی چاك و ڕەفتاری جوان و تەقوات لێ دەکەین و داوای کارێکت لێ دەکەین کە پێ ی ڕازی بیت.. خوایە ئەم گەشتەمان بۆ ئاسان بکەو دووریەکەیمان بۆ نزیك بخەرەوە. خوایە تۆ ئاگات لێمانە لە گەشتەکەمانداو تۆ پارێزەری کەس و کارمانی (کە جێمان هێشتوون). خوایە پەنات پێ ئەگرم لە ناڕەحەتی و ناسۆری گەشت و غەمباری ڕواڵەت و شتێك کە غەمبارم بکات و خراپ گەڕانەوە بۆ ماڵ و خێزان (بەوەی کە شتێکیان لێ ببینم دڵ تەنگم بکات)... گەڕاینەوە لە بێ ئاگایی (بەویستی خوا). بە تەوبەکردن و پەرستشەوە، ستایشی پەروەردگارمان دەکەین.

## نزای چوونە بازاڕ

{لا إلهَ إلاّ الله وَحْدَهُ لا شَريكَ لَه، لَهُ المُلْكُ وَلَهُ الحَمد، يُحيي وَيُميت وَهوَ حَيٌّ لا يَموت، بيَدِهِ الخَير، وَهوَ عَلى كُلِّ شَيءٍ قَدير}[٢٣٠].

**واتە: هیچ پەرستراوێك نی یە بە هەق جگە لە (الله) تاکی لێ هاوەڵەو موڵك و ستایش بۆ ئەوەو ئەژیەنێ و ئەمرێنێ و خۆی زیندووەو هەرگیز نامرێ. خێرو چاکە بەدەست ئەوەو بەسەر هەموو شتێکدا بە تواناو دەستەلاتدارە.**

## نزاو پاڕانەوەی ئەو کەسەی دەچێت بۆ گەشت (المُسافِر) بۆ جێماو

{أَسْتَوْدِعُكُم اللهَ الّذي لا تُضيعُ عِنْدَه وَدائِعه}[٢٣١].

**واتە: ئەتان سپێرم بەو خوایەی کە سپاردە زایە ناکات.**

---

[٢٣٠]) هەر کەسێك ئەمە بڵێ هەزار هەزار (ملیۆنێك) چاکەی بۆ دەنووسرێ و هەزار هەزار گوناهی لێ هەڵدەوەرێ و هەزار هەزار پلە پلە بەرز دەبێتەوە لای خوای گەورە (وە ماڵێکی لە بەهەشتدا بۆ دروست دەکرێت) . الترمذي ٢٩١/٥ والحاكم ٥٣٨/١ وحسنه الألباني في صحيح ابن ماجه ٢ وفي صحيح الترمذي ١٥٢/٣.

[٢٣١]) احمد ٤٠٣/٢ وابن ماجه ٩٤٣/٢ وانظر صحيح ابن ماجه ١٣٣/٢. وصحيح الجامع (٩٥٨).

## نزاو پاڕانەوەی جێماو بۆ کەسی مسافر

{أَسْتَوْدِعُ الله دينك وأمانتك وخواتيم عملك}[٢٣٢].

**واتـە: ئـایین و ئەمانـەت و کۆتـایی کردەوەکانـت بـەخودا دەسپێرم.**

## نزاو زیکری گەڕانەوە لە گەشت

**لە ابن عمرەوە (ڕەزای خوایان لێ بێت) : پێغەمبـەری خـوا ﷺ ئەگەر لە غەزا یان لە حەج بگەڕایەتەوە لەسـەر هـەموو بەرزاییـەك سێ جار (الله اكبر)ی دەكردو پاشان دەیفەرموو :** {لَا إِلَهَ إِلَّا اللَّهُ وَحْدَهُ لَا شَرِيكَ لَهُ، لَهُ الْمُلْكُ وَلَهُ الْحَمْدُ وَهُوَ عَلَى كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ، آيِبُونَ تَائِبُونَ عَابِدُونَ سَاجِدُونَ لِرَبِّنَا حَامِدُونَ، صَدَقَ اللَّهُ، وَعْدَهُ وَنَصَرَ عَبْدَهُ وَهَزَمَ الْأَحْزَابَ وَحْدَهُ}[٢٣٣].

**واتـە: هـیچ پەرستراوێك نیـە بـە هـەق جگـە لـە (الله) تـاكی بـێ هاوتایـە. موڵـك و سـتایش بـۆ ئـەوەو بەسـەر هـەموو شـتێكدا بەتوانایـە. گەڕاینـەوە لـە بـێ ئاگـایی بـە تەوبـەكردن و پەرستش**

---

[٢٣٢] رواه الترمذي وصحيحه الالباني.

[٢٣٣]) البخاري ١٧٩٧ومسلم ٩٨٠/٢ و ١١٢/٩.

کردن و کوڕنوش بردنەوە. سوپاس و ستایشی پەروەردگارمان دەکەین. خوای گەورە بەڵێنەکەی بەڕاست بەجێ هێناو بەندەکەی خۆی سەرخستو بەتەنها خۆی هەموو کۆمەڵ و پارتەکانی شکاند.

## لەکاتی هاتنی شتێکی خۆش یان ناخۆشی دا

پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر شتێکی خۆشی بەسەردا بهاتایە دەیفەرموو : {الحمْدُ لله الّذي بِنعْمَتِه تتِمُّ الصّالِحات} .

واتە: سوپاس و ستایش بۆ ئەو خوایەی کە بە نیعمەتی ئەوەوە هەموو چاکەکان تەواو دەبێ.

وە ئەگەر شتێکی ناخۆشی بەسەردا بهاتایەوە دەیفەرموو: {الحَمْدُ لله على كُلِّ حالٍ} . واتە: سوپاس و ستایش بۆ خوایە لەسەر هەموو بارێك.[234]

[234] اخرجه ابن السني في عمل اليوم والليلة والحاكم وصَحَّحَهُ ٤٩٩/١ وصَحَّحَهُ الألباني في صحيح الجامع ٢٠١/٤.

## چۆن وەڵامی بێ بڕوایەک دەدەیتەوە ئەگەر سڵاوی کرد

{إذا سَلّم عَليكُم أهلُ الكتاب فَقولُوا : وَعَلَيكُم} [٢٣٥]

واتە: ئەگەر خاوەن کتێبەکان (گاوڕو جولەکە) سڵاویان لێ کردن بڵێن : لە ئێوە بێ.

تێبینی (١) : سڵاوکردن دروست نیە لە کافرو بێ بڕواو دووڕووەکان، مەگەر ترسی زەرەرێکی دین و دونیا بکەیت لە ئەنجامی ئەو سڵاونەکردنەوە لێ ی وەك ئیمامی نەوەوی و ابن العربی دەفەرموون. [٢٣٦]

وابن العربی زیاد لەوەش دەفەرمووێت : وە دەبێ لە وتنی (السّلامُ عَلَيكم)ەکەش مەبەستت وابێ کەوا خوای گەورە ئاگادارە بەسەرتانەوە. چونکە (السّلام) ناوێکە لە ناوەکانی خوای گەورە.

تێبینی (٢) : سڵاوکردن لە مەجلیسێکی تێکەڵ لەکافرو موسڵمان دروستە بە مەرجێ مەبەستت موسڵمانەکانی بێت. [٢٣٧]

---

[٢٣٥] البخاري مع الفتح ٥٥/١ ومسلم ١٧٠٥/٤. لە ڕیوایەتێکی تردا دەفەرمووێ : (چونکە لەو کاتەدا پێتان دەڵێن (السّلامُ عَلَيكُم) واتە: مردن بۆ ئێوە بێت). البخاری ٤٢/١١ ومسلم ١٧٠٦/٤.

[٢٣٦] فتح الباري ٤٠/١١.

[٢٣٧] ئیمامی بوخاری ڕیوایەتی کردووە. فتح الباري ٣٨/١١.

## لەکاتی خوێندنی کەڵەشێرو زەڕەی گوێ درێژدا

ئەگەر گوێتان لە دەنگی کەڵەشێر بوو داوای فەزڵی خوای گەورە بکەن (اللهُمّ إنّي أسألُكَ مِن فَضلِك) چونکە مەلائیکەتی بینیوە. وە ئەگەر گوێتان لە دەنگی زەڕینی گوێ درێژ بوو پەنا بگرن بەخوای گەورە لە شەیتان (أعوذُ بالله مِن الشيطانِ الرّجيم) چونکە شەیتانی بینیوە.[٢٣٨]

## ئەگەر گوێت لە دەنگی سەگ بوو بە شەو

{إِذَا سَمِعْتُمْ نُبَاحَ الْكِلَابِ وَنَهِيقَ الْحُمُرِ بِاللَّيْلِ فَتَعَوَّذُوا بِاللَّهِ فَإِنَّهُنَّ يَرَيْنَ مَا لَا تَرَوْنَ}[٢٣٩].

واتە: ئەگەر گوێتان لە دەنگی وەڕینی سەگ و زەڕەی گوێ درێژ بوو بە شەو ئەوا پەنا بگرن بە خوای گەورە لێ یان چونکە ئەوان شتێك دەبینن لەوکاتەدا کە ئێوە نایبینن.

[٢٣٨] البخاري مع الفتح ٦/٣٥٠ ومسلم ٢٠٩٢/٤.

[٢٣٩]) ابو داود ٣٢٧/٤ واحمد ٣٠٦/٣ وصححه الالباني في صحيح ابي داود ٣ / ٩٦١.

## موسڵمان چی بڵێ لەکاتی مەدح کردنی موسڵمانێك دا

پێغەمبەر ﷺ دەفەرمووێت : ئەگەر یەکێ لە ئێوە هەردەبوو بە چاکە باسی هاوەڵەکەی بکات بابڵێ : { أَحْسِبُ فُلَانًا وَاللَّهُ حَسِيبُهُ وَلَا أُزَكِّي عَلَى اللَّهِ أَحَدًا أَحْسِبُهُ -إِنْ كَانَ يَعْلَمُ ذَاكَ- كَذَا وَكَذَا }[٢٤٠].

واتە: وا گومان دەبەم و وابزانم کە فلأنە کەس (کەخوای گەورەش باشتر دەیناسێ و دەزانێ و کەس بەسەر خوای گەورەدا پاك ڕاناگرم) وای دەناسم -ئەگەر ئەو سیفەتەی تێدا شك برد- ئاواو ئاوایە.

## موسڵمان چی دەڵێ ئەگەر بە باش باس کرا

{اللَّهُمَّ لا تُؤاخِذْنِي بِمَا يَقولون، وَاغْفِر لِي مَا لا يَعْلَمون (وَاجْعلني خَيراً مِمَّا يَظُنُّون) }[٢٤١].

واتە: خوایە ئەوەی ئەوان دەیڵێن بە گوناه لەسەرم مەگرەو لەو گوناهانەم خۆش ببە کە ئەوان نایزانن و لەو مەدح و وەسفە چاکترم بکە کە ئەوان گومانم پێ دەبەن.

---

[٢٤٠]) رواه مسلم ٢٢٩٦/٤.

[٢٤١]) البخاري في الأدب المفرد برقم ٧٦١، وصحح إسناده الألباني في صحيح الأدب المفرد برقم ٥٨٥، وما بين المعكوفين زيادة للبيهقي في شعب الإيمان ٢٢٨/٤ من طريق آخر.

## لەکاتی سەرسوورمان و بینینی شتی سەیردا

١- (سُبحانَ الله)[٢٤٢]. واتە: پاك و بێ گەردی بۆ خوایە.

٢- (اللهُ أكبر).[٢٤٣] واتە: خوا گەورەیە.

## چی ئەکات ئەگەر هەواڵێکی خۆشی بۆ هێنرا

{كانَ النبيُّ ﷺ إذا اتاهُ امرٌ يَسُرُّهُ أو يُسَرُّ بِه خَرَّ ساجِدا شُكراً للهِ تَبارَكَ وتَعالى}[٢٤٤]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ ئەگەر هەواڵێکیان بۆ بهێنایە دڵی خۆشی بکردایە یان پێ ی دڵخۆش بووایە کوڕنووشی دەبرد لە سوپاسی خوای گەورەدا.

---

[٢٤٢] البخاري مع الفتح ٢١٠/١ و ٣٩٠ و ٤١٤ ومسلم ١٨٥٧/٤.

[٢٤٣] البخاري مع الفتح ٤٤١/٨ وانظر صحيح الترمذي ١٠٣/٤ و ٢٣٥/٢ ومسند احمد ٣١٨/٥.

[٢٤٤] رواه اهل السنن غلا النسائي . انظر صحيح ابن ماجه ٢٣٣/١ وإرواء الغليل ٢٢٦/٢.

## چی دەڵێت ئەگەر لە چاوی خۆی ئەترسا بدا لە شتێك و ببێتە خۆی زیان پێ گەیاندنی

{(ماشآء الله لا قوّة إلاّ بالله) اللهمّ بارك عليه}[٢٤٥]

واتە: ئەوەی خوای گەورە ویستی ببێت دەبێ و هێزو توانایەك نی یە مەگەر بەخواوە. خوایە فەڕو بەرەكەت تێ بخە.

## ئەگەر لە چاوی یەكێك ترسایت

سوڕەتی {الفلق} و {الناس} بخوێنە.[٢٤٦]

## ئەگەر كەسێك چاو لێ یدا

با چاو پیسەكە دەست نوێژ بگرێت و پاشان ئاوی دەست نوێژەكە بكەن بەسەر ئەو كەسەدا كە چاو لێ ی داوەو خۆی پێ بشوات.[٢٤٧]

---

[٢٤٥] بۆ بەشی یەكەمی بڕوانە سوڕەتی (الكهف) ئایەتی ٣٩. وە بۆ بەشی دووەمیش پێغەمبەری خوا ﷺ دەفەرموێت: (ئەگەر یەكێك لە ئێوە شتێكی لەبراكەی یان لەخۆی یان لە ماڵ و سامانی دا بینی كە سەرسامی كردبوو وە بەلایەوە سەیربوو (با بپاڕێتەوە بۆی بە بەرەكەت) چونكە چاو ڕاست و ڕەوایە) مسند احمد ٤٤٧/٤ وابن ماجه. ومالك. وصححه الالباني في صحيح الجامع ٢١٢/١ وانظر تحقيق زاد المعاد للأرناؤوط ١٧٠/٤.

[٢٤٦] رواه الترمذي والنسائي وابن ماجه عن أبي سعيد الخدري رضي الله عنه. حديث حسن/ انظر الاذكار للنووي ص ٢٨٣.

## سوننەتەکانی فیطرەت

عـن عائشـة (رضـى الله عنهـا) قالَـتْ : قـالَ رسـول الله ﷺ : (عَشـرٌ مِـنَ الفِطْـرة : قـص الشـارب، وإعفـاءُ اللِّحيَـة، وَالسِّـواك، وَإستنشاقُ الماء، وَقَصُّ الأظفار، وَغَسلُ البَراجِم، وَنَتْـفُ الإبـط، وَخَلقُ العانةِ، وانتِقاصُ الماءِ) قال الـراوي : ونَسـيتُ العاشـرَة إلاّ أن تكـونَ (المَضْمَضَـةُ). قـال وَكيـع –وهـو أحـدُ رواتـهِ– : إنْتـاصُ الماءِ : يعني الإستنجاءَ.[248]

واتـە: (١٠) شـت لـە فترەتەوەیـە : سمێـڵ كـورت كردنـەوە و ڕیش هێشتنەوەو سیواك كردن و ئاو لـە لـووت وەردان و نینـۆك كردن و شۆردنی (البراجم) : (کە کۆی (برجمة)یە، واتە : (ئەو شـوێنانەی کـە چـڵکی تێـدا کـۆ دەبێتـەوە وەك خـەتی سـەر پەنجەکان). وە هەڵکێشـان و لابردنـی مـووی بـن بـاڵ و تاشـینی مووی داوێن و شەرمگاو (إنتقاصُ الماءِ).

---

[247] ابي داود ٤/٩ بإسناد صحيح على شرط البخاري ومسلم عن عائشة (رضي الله عنها) وزاد المعاد ٤/١٦٣ . انظر الاذكار للنووي ص ٢٨٣.

[248] رواه مسلم (٦٠٣) و ابو داود (٥٣)، وە لە فەرموودەی تردا بەم جۆرەش هاتووە : عن ابی هریرە ﷺ عن رسول الله ﷺ قال : (الفِطرةُ خَمسٌ : الإختتانُ والإستِحدادُ . وَقَصُّ الشَارِبِ وتَقليمُ الأظفار. وَنَتفُ الإبطِ) صحيح. ابن ماجه (٢٩٢)ق (آداب الزفاف ١١٧ وارواء الغليل ٧٣) انظر صحيح سنن النسائي باختصار السند للالباني ص٥.. واتە: فیترەت پێنجە: یان پێنج شت لە فیترەتەوەیە: خەتەنەکردن و تاشینی مووی شەرمگاو سمێڵ کورت کردنەوەو نینۆك کردن و توکی بن باڵ هەڵکێشان.

ڕاوی دەفەرمووێت : (دە)یەمم لەبیر چۆتەوەو پێم وابێت : ئاو لــە دەم وەردانــە. وە (وەکیــع) -کــە یەکێکــە لــە ڕاویــەکانی- دەفـــەرمووێت : (إنتقـــاصُ المـــاءِ) واتـــە: تـــارەت گـــرتن و خۆپاکردنەوە بە ئاو.

عـن انَـس بـن مالِـك قـالَ : (وُقّـت لَنـا رسـولُ الله ﷺ في قَـصِّ الشـارب وتقليم الأظفار. وحلْق العانة. وَنَتْفُ الإبط أن لا نَترُك اكثر منْ أربعين يوماً) وقال مرّةً أخرى (اربعين لَيلَةً.[٢٤٩]

واتە: پێغەمبەری خوا ﷺ بۆی داناوین کە کورت کردنـەوەی سمێڵ و نینۆك کردن و لابردن و تاشینی مووی شەرمگاو تـوکی بـن بـاڵ هەڵکێشـان لـە چـل ڕۆژ یـان چـل شـەو زیـارت واز لێ نەهێنین.

---

[٢٤٩] صحيح. ابن ماجه (٢٩٥) م.انظر صحيح سنن النسائي باختصار السند للالباني ص٥.

## سمێڵ کورت کردنەوەو ریش بەردانەوە

عن ابن عُمَر عَنِ النَبيٌ ﷺ قال : (احفُوا الشَوارب واعفُوا اللّحيَ)[٢٥٠].

واتە: سمێڵ کورت بکەنەوەو ڕیش بهێڵنەوە.

## کورتی پۆشاک و نەخشاندنی بەدوای خۆی دا

(ما تحْت الكعبين منَ الإزارِ ففي النّار)[٢٥١]

واتە: ئەوەی کە ئەکەوێتە ژێر دوو قولە پێ کەوە لە پۆشاك لە ئاگردایە.

تێبینی یەکی گرنگ :

ئیمامی النّووی (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) دەفەرمووێت : (پۆشاك درێژی لە کراس و قەمیص و عەمامەو پۆشاك دایە. وە

[٢٥٠] صحيح. الترمذي (٢٩٢٥) و (٢٩٢٦): ق (رياض الصالحين ١٢١٣ وصحيح الجامع ٢٠٧) انظر صحيح سنن النسائي باختصار السند للالباني ص(٦).

[٢٥١] رواه الامام احمد ٢٥٤/٦ وهو في صحيح الجامع (٥٥٧١). والبخاري هێناویەتی (٢١٨/١٠) بە لەفزی : (ما اسفَلَ مِنَ الكَعبينِ مِنَ الإزارِ ففي النارِ) عن ابي هريرةﷺ.

دروست نی یە ئەگەر بۆ خۆبەزل زانی و فیز بوو بهێڵرێتەوە تا خوار قولە پێ کان . خۆ ئەگەر بۆ فیز نەبوو مەکروهە. وە موستەحەبە تا ناوەڕاستی قاچ بێت. وە دروستیشەو مەکروە نی یە کە بگاتە دوو قولە پێ کە. بەڵام لەوە دابەزێ یاساغ کراوە لە شەرع دا).

وە ئیبن حەجەر (ڕەحمەتی خوای لێ بێت) لە (فَتحُ الباری)دا دەفەرمووێت : (وە قاضي عیاض ئیجماعی هێناوە لەسەر ئەوەی ئەم مەنعە دەرهەق بە پیاوانەو ئافرەتان ناگرێتەوە (واتە درێژکردنەوەی پۆشاك تا خوار قولە پێ کان). پاشان دەفەرمووێ : (بەهەرحاڵ پیاوان دوو حاڵەتیان بۆ هەیە: یەکێکیانە باشەو ئیستحبابە و ئەویش ئەوەیە کە پۆشاکەکەی کورت بکاتەوە تا ناوەڕاستی ئێسقانی قاچی. وە حاڵەتێکی تریش کە دروستە و جائیزە تا دوو قولە پێ کە)[٢٥٢]

وە جیاوازی نی یە لەمەدا لە نێوان پۆشاکی (عەرەبی یان کوردی یان فارسی یان تورکی یان ...هتد).

[٢٥٢] بڕوانە کتێبی (قُطوف منَ الشمائل المحمدیة)ی محمد جمیل زینو لاپەڕە ٩٩.

وە ئەگەر ئەم کارەی بۆ فیزو خۆبەزل زانی دەکرد ئەوا سزاکەی سەخت تر دەبێت ئەم جۆرە کەسانە لە ڕۆژی دوایی یدا لەو کەسانەن کە خوای گەورە قسەیان لەگەڵ ناکات و تەماشایان ناکات و لە گوناه پاکیان ناکاتەوەو سزای بۆ هەیە.[٢٥٣]

[٢٥٣] رواه مسلم(١٠٦) عن ابي ذر ﷺ.

